


# ئازادیی رادەربڕین لەنێوان ئاین‌و ئازادیدا

" گرفتی بەریەککەوتنی نێوان رۆشنبیران‌و مامۆستایانی ئاینی لەکۆمەڵی کوردیدا"

سەلام عەبدولکەریم

سلێمانی
چاپی یەکەم
2009

ناوی کتێب: ئازادی رادەربڕین لەنێوان ئاینو ئازادیدا
بابەت: فیکریو ئاینی
نوسینی: سەلام عەبدولکەریم
دیزاینی بەرگو ناوەوە: ئارام عەلی مەجید
چاپ: یەکەم
شوێنو ساڵی چاپ: سلێمانی، 2009.
چاپخانەی: سایە
زمارەی سپاردن(  )وەزارەتی رۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستان

# پێڕست

## پێشەکی

ئازادی لەبنەڕەتدا یەکێکە لەمافە بنەڕەتی‌و سەرەکییەکانی مرۆڤ، بەجۆرێك مرۆڤ بەبێ ئازادی بوونی نییە. ئازادیش بۆخۆی شوناسێکی گشتگیریی هەیەو بەش بەش‌و پارچە پارچە ناکرێ. بەمانایەکیتر هەوڵی مرۆڤ بۆبەدەستهێنان‌و دواتریش بۆمومارەسەکردنی ئازادی هەوڵ‌و ماندووبوونە بەدوای جۆرەکانی ئازادی‌و ئەو پانتاییانەش کەدەیەوێت تیایدا بژی‌و مومارەسەی ئازادی تێدا بکات.

بێگومان پرسی ئازادی‌و ئازادی ڕادەربڕین لەسەردەمە کۆنەکانی مێژووەوە تاوەکو چرکەساتی ئێستا پرسێکی گەرم‌وگوڕ‌و گرنگی مرۆڤایەتی بووە، ڕەنگە هەڵە نەبێ گەر بڵێین بەشێکی هەرە زۆری کێشە گەورەکانی جیهان بەگشتی‌و مرۆڤایەتی کێشەی ئازادی بووە، بەتایبەت ئەگەر زیاتر ورد ببینەوە لەمانای ئازادی‌و جۆرەکانی ئازادی. دەبێ ئەوەش بوترێ کەمرۆڤ پیرۆزترین کاڵاو شمەکی خۆی کەگیان‌و ڕۆح بووە کردووە بەقوربانی بەدەست هێنانی ئازادی، واتە مێژووی ئازادی مێژووی خوێنە.

لەم نێوەندەدا ئازادی ڕادەربڕین‌و ئازادی قسەکردن یەکێك لەجۆرە گرنگەکانی ئازادی بووە، بەشێوەیەك مرۆڤ ئەگەر توانای ئازادی نەبوو بۆقسەکرن، یاخود نەیتوانی بەئازادی بڵێ‌و بنوسێ‌و بیر بکاتەوە ئەوکاتە جگە لەبونەوەرێکی کۆت‌و پێوەند کراو هیچی دیکە نییە. بۆیە پێداگرتن لەسەر پێوستی

کەشێکی ئازادانە بۆقسەکردنو دواتریش کارکردنی لەسەر بەرهەم هێنانی توانایەك بۆموماڕەسەرکردنی ئازادی ڕادەربڕینو ئازادی قسەکردن هەموو ئەمانە بەشێکن لەپێداویستییە گەورەکانی ژیانی مرۆڤ.

ئەگەر سەیری سەردەمەکانی مێژووی مرۆڤایەتیش بکەین لەهاتنی پێغەمبەرانەوە تادەگاتە سەردەمەکانی ڕێنیسانسو ڕۆشنگەریو شۆڕشی فەرەنسیو مۆدێرنەو سەردەمەکانی دواتریش بەردەوام مرۆڤ بەدوای دەستەبەرکردنی ئازادی ڕادەربڕینو توانای قسەکردنی ئازاد دا گەڕاوەو کۆششی کردووە. بۆیە ئازادی ڕادەربڕینیش هەموو ئەو کۆسپو گرانیو کۆتو پێوەندانەی بینیوە تاوەکو گەیشتۆتە ئەو ئاستەی کەمرۆڤ لەمرۆڤدا بەئازادانە بتوانێ گوزارشت لەبیروڕاو بۆچوونەکانی خۆی بکات بەبێ هیچ سانسۆرێك.

جیهانی ئیسلامیو عەرەبیو بەکوردستانیشەوە لەقەیرانێکی گەورەدا دەژی، بەجۆرێك هەم کێشەی ئازادیو هەم کێشەی ئازادی ڕادەربڕینو ئازادی قسەکردن بۆتە یەکێك لەقەیرانە سەرەکییەکانی ژیانی مرۆڤ لەم کۆمەڵگایانەدا. بەدەیان ڕۆشنبیرو نوسەرو ڕووناکبیر بەهۆی سانسۆرو قەدەغەکردنی ئازادی قسەکردنو بیروڕاکانیانەوە بوونە قوربانیو ئەوەش کەرزگاری بووە وڵاتی بەجێهێشتووەو بۆرۆژئاواو ئەوروپا هەڵهاتووە. لەرۆژهەڵات بەگشتیو لەجیهانی ئیسلامیدا کەهیچ پرۆسەیەکی وەك ڕێنیسانسو ڕۆشنگەریو ریفۆرمی ئاینیو شۆڕشی پیشەسازی تێدا ڕووینەداوەن قسەکردنی

ئازادانــە لەســەر بەشــێکی زۆری پانتاییــەکانی ژیــان بڤــەو قەدەغەو هێڵــی ســورە، بەتایبــەت قســەکردن لەســەر ئــاینو سێکس ودەسەڵات. زۆرجار ئەو پێوەرەش کەئــەم قســەکردنو ئــازادی ڕادەربڕینــە قەدەغــە دەکــات ئــارەزوو خواســتو لێکدانەوەو ڕاڤەی گروپێکی کۆمەڵایەتی کەمە بۆقــۆرغکردنی شتەکان لەچــنگی خۆیانــداو ئــەوانیش بــەجۆرێك لــەجۆرەکان بەرگری لەبەرژەوەندیو نفوزی کەمینەیەکی دەسەڵاتدار دەکەن لەرووی سیاسیو ئاینیو کۆمەڵایەتیو ئابورییەوە.

لەکۆمەڵگــەی کــوردیو لەکوردستانیشــدا ئــازادی بەگشــتیو ئازادی قســەکردن بەتــەواوی دەســتەبەر نــەکراوەو تائێســتاش قســەکردن لەســەر هەنــدێ پانتــایی وەکــو(ســێکسو ئــاینو دەسەڵات)باجی لەدواوەیە، بەجۆرێك ڕەنگە نازانســتی نــەبێت گەر بڵێین ئازادی ڕادەربڕینو قســەکردن لەقەیراندایــە، چــونکە هەم هەڕەشە لەرۆژنامەنووسانو نوسەرانو رۆشنبیران کــراوەو دەکــرێ، هــەم کۆمــەڵێك نوســەرو رۆشــنبیرو رۆژنامەنووســی ئەکتیڤیست تیرۆرکراونو بەناڕوا خوێنیان رژاوە. ڕەنگە دواترین ڕووداوی دڵتەزێن تیرۆرکردنی رۆژنامەنووسی لاو(سۆران مامــە حەمە) بێت لەشاری کەرکوك. هەمووومان ئەو ڕاســتییە بــاش دەزانین کەسۆران باجی قسەکردنی ئازادانــەو مومارەســەکردنی ئازادی ڕادەربڕینــی خــۆی داو هــەر ئــەوەش بەشــێکی گــەورە لەهۆکاری کوشتنو تیرۆرکردنەکەی پێکدەهێنێت.

لەئێستاشداو لەچەند ماوەی رابردوودا هەندێ ڕووداو روویانــدا کەبەراستی پرسی ئازادیو ئازادی ڕادەربڕینــی خســتۆتە ســەر

دوو ریانێکی مەترسیدار، بەتایبەت خەریکە رووبەڕووبونەوە لەنێوان دوو چینی گەورەو هەستیاری کۆمەڵگەدا دێتە ئاراوە، کەئەوانیش ڕۆشنبیرانو مامۆستاو مەلایانی ئاینیو ئیسلامین، ڕەنگە هەڵە نەبێ گەر لێرەوە ئەم قەیرانە ناو بنێین قەیرانی بەریەککەوتنو پێکدادانی نێوان ڕۆشنبیرانو مامۆستایانی ئاینی لەهەردوو پانتایی موقەدەسو ئازادی ڕادەربڕیندا. هەروەك بەشێك لەڕۆشنبیرانو نوسەران ئەم دیاردەو قەیرانە وەك قەیرانی دووركەوتنەوەو دوو لەتبەووتی ئەم دوو گرپە کۆمەڵایەتییە شرۆڤە دەکەن. چونکە کۆمەڵگەی کوردی خەریکە دەبێتەوە بەکۆپییەکی یەکێك لەکۆمەڵگە عەرەبیو ئیسلامییەکان، بەجۆرێك هەرچی دەنوسرێو دەوترێو بەرهەم دەهێنرێ بەتایبەت لەپانتایی ئایندا، بەبێ خوێندنەوەو بەبێ جیاکاریو بەبێ لێکدانەوەی وردی مەعریفی لەلایەن مامۆستایانی ئاینیو مەلا بەڕێزەکانەوە ڕەتدەکرێتەوەو دەخرێتە لیستی قسەکردنو نوسینە قەدەغەکانەوە. وەنەبێ ئەم قەیرانە تەنها پەیوەست بێت بەمامۆستایانی ئاینییەوەو ئەوان بەتەنها پانتاییەکانی ئازادی ڕادەربڕین بەرتەسك بکەنەوە، بەڵکو هەندێ لەڕۆشنبیرانو نوسەرانیش لەرێگەی نوسینی هەندێ کتێبو وتارو نوسینو بیروڕاوە کە لەبنەڕەتدا دوورن لەسادەترین پێوەرو بنەماو مەرجی نوسینی زانستیو قسەکردنی بابەتییەوەو بەپێچەوانەشەوە پڕو لێواو لێون لەجنێوو تەشهیرو سوکایەتیو تۆمەتبارکردنی ئاینو کاراکتەرەکانیو سیمبوڵەکانی، تادەگاتە

جنێودان و قسەی بازاڕی و ناشیرین وتن بەخوداو پێغەمبەر. بەراستی ئەم جۆرە نوسینانە نەپێیان دەوترێ نوسین و قسەکردنی زانستی و بابەتی وە نەرەوایەتیشی هەیە بەناوی ئازادی نوسین و ئازادی رادەربڕینەوە. بەلاّم ئەو نوسین و قسەکردنانەی هەم زانستین و هەم جدی و بابەتیشن دیسان بەشێکی زۆریان کەوتوونەتە بەر رەتکردنەوەوەو خەریکە ئایندەی ئازادی رادەربڕین بەرەو ئایندەیەکی تەمو مژاوی و ترسناک هەنگاو دەنێت.

بۆیە ئێمە وەك پێویستییەکی مەعریفی و وەك ئەرکێکی رۆشنبیریی و روناکبیریی بەپێویستمان زانی ئەم توێژینەوەیە بکەینە ئامرازێك بۆگفتوگۆکردن و بەدواداچوونی ئەم قەیرانەو خوازیارین ئەگەر شیاوبێت بتوانین پێشکەشی کتێبخانەی کوردی بکەین، چونکە مەسەلەی ئازادی و ئازادی رادەربڕین پەیوەندییەکی هەستیاری بەژیان و بوونی هەموو لایەکمانەوە هەیەو رەنگدانەوەو کاریگەریشی بەهەر بارێکدا بۆسەر هەمووومان دروستدەکات و کاتی ئەوەش هاتووە قسەی بابەتی و زانستی لەسەر بکرێت. هیواداربن توانیبێتمان هەولێکی زانستیمان دابێت و خزمەتێکمان بەوشەی ئازادو ئازادی رادەربڕین و ئازادی قسەکردن لەکوردستاندا کردبێت.

سەلام عەبدولکەریم
خوێندکاری دواقۆناغی ماستەر لەبواری مێژووی هاوچەرخ
لە زانکۆی سلێمانی
2009/2/20
Salam_80jornalist@yahoo.com

بەشی یەکەم (ئازادیو ئازادی رادەربڕین..چەمك و پێناسە..
مێژووی سەرهەڵدان)

"مرۆڤەکان
بەئازادی
لەدایکبوون، بەڵام
لەهەموو شوێنێك
بەکۆت و پێوەند
بەستراونەتەوە "
جان جاك رۆسۆ

باسی یەکەم(لەبارەی ئازادیو ئازادی رادەربڕینەوە)

ئەمڕۆ مرۆڤایەتی رووبەڕووی کێشەی زۆر بۆتەوە، بەجۆرێك بەشێك لەکێشەکانی ئەمڕۆ درێژکراوەی کێشەو گرفتەکانی دوێنێن. وەك ئەوەی فەیلەسوفی گەورەی رۆشنگەری(کانت)روونی کردۆتەوە کە جیهان بەرەو بچووکبوونەوەیەکی بێوێنە دەڕوات.

لەم نێوەندەدا مەسەلەی ئازادیو ئازادی رادەربڕین و ئازادی قسەکرن یەکێك لەو بابەتانەیە کە لەبەشێکی زۆری کۆمەڵگە جیاوازەکاندا جەدەل و گفتوگۆو بەریەککەوتنی لەسەرە. دیارە دەبێ ئەوە بڵێین کەکێشە یان جەدەل و گفتوگۆ لەبنەڕەتدا کێشەو جەدەل و بەریەککەوتنە لەسەر خودی ئازادی خۆیو لەگەڵیشیدا جۆرەکانی ئازادی، چونکە ئازادی رادەربڕین هەرگیز دابڕاو نیە لەچەمکی ئازادیو جۆرەکانیتری ئازادی،

وەك ئازادی هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی، ئازادی بینین، ئـازادی بەشداری سیاسیو ئازادی کارکردنو...تاد، بەڵام ئـەم قەیرانـە گرفتێکی قوڵو ریشەدارە، بەتایبەت لەکۆمەڵگـەی کوردیـدا، کەخۆی بەسەدان سـاڵە بـەدوای چـەمکی ئازادیـدا وێڵبـووەو خەباتو قوربانیداوە، واتە قسەکردن هەم لەسەر ئازادیو هـەم لەسەر ئازادی ڕادەربڕینیش لای نەتەوەو کۆمەڵگەیەك کەخۆی بەسـەدان سـاڵ لێـی قەدەغـەکراوەو چـەند سـاڵێکی کەمـە ئازادبووە، هەروا ساناو ئاسایی نییە. بۆیـە کێشـەو قـەیرانی ئازادی کێشەیەکە پەیوەندی بـەبونیادی روانـینو بیرکردنـەوەی ئێمـــەوە بۆئـــازادی هەیـــە. بەشـــێوەیەك (بـــەختیار عەلی)دەڵێت:"لەهەر جێگەیەکدا بیرکردنەوە لـەمانای ئـازادی نەبوو، هیچی گرنگی دیکەش نییە، بیرکردنەوە لەئازادی نەوەك دروشمی ئازادی.."(1). هەروەك بەختیار جیاوازی لـەنێوان دوو شتی سـەرەکیدا دەکـات، کەئـەوانیش بیرکردنـەوە لـەئازادیو دروشمەکانی ئازادییە، تادەگاتەوە ئەوەی بڵێت:" مێژووی ئێمە مێژووی دروشمەکانی ئازادییە، نەوەك مێژووی بیرکردنەوە بێـت لـــەئازادی".(2) بۆیـــە بـــەحوکمی چـــەندین هۆکـــار ئێمـــە نەمانتوانیوە کار لەسەر بیرکردنەوە لـەئازادی بکـەین، ئـەوەی دوێنێو ئەمرۆ لەبەریەککەوتنو گفتوگۆو تەنانـەت هەڕەشـەو پێکدادانی توند روودەدات لەسەر ئازادیو ئـازادی ڕادەربـڕینو ئـــازادی قســـەکردن لـــەنێوان هێـــزو گروپـــە کۆمەڵایـــەتیو سیاسییەکانی ئێمەدا پەیوەندی قوڵی بەفۆرمەلە نەبوونو گەشە نەسەندنی تەندروستانەی ئازادییەوە هەیە، چونکە ئەگەر خودی

ئازادی خۆی سروشتانەو تەندروستانە گەشەی کرد، ئەوا زەمینە بۆئازادی ڕادەربڕین‌و جۆرەکانی تری ئازادی دەرەخسێ‌و سروشتانەش لەگەڵ پێشکەوتنی کۆمەڵ‌و گۆڕانکارییەکاندا گەشە دەکات.

لەمبارەوە(مەریوان وریا قانیع) دەڵێت:" ئازادی دەبێت ببێتە ئەو زەمینە سیاسی‌و کولتوری‌و ئەخلاقییەی کەهەمووان تێیدا ئامادەن‌و بەهەمووان هەمان مافی بوون‌و گەشەکردن‌و ڕێزو قسەکردن دەبەخشێت، بوونی کەناڵی تەعبیرکردنی ئازاد، بوونی فەلسەفەیەکی ئەخلاقی بارگاویکراو بەبیرۆکەی لێبوردن‌و قبوڵکردنی جیاوازی، بوونی دیالۆگ لەشوێنی قێزەونکردن،...."[3]. بۆیە کاتێك ئازادی نابێتە ئەم پانتاییەی سەرەوە ئەوکات بەدیلەکەی بەریەککەوتن‌و پێکدادانی نێوان هێزە کۆمەڵایەتی‌و ئایدۆلۆژی‌و سیاسییە جیاوازەکان دەبێت. بێگومان ڕەنگە قسەکردن لەئازادی ڕادەربڕین وەك جۆرێك لەجۆرەکانی ئازادی، پڕ کێشەترین بابەت بێ، لەگفتوگۆو جەدەلەوە بیگرە تادەگاتە بەریەککەوتن‌و هەڕەشەو کوشتنی فیزیکی‌و ڕەمزی. ئەگەر تارادەیەك هێزە کۆمەڵایەتییەکان لەسەر پێویستی ئازادی هاوڕا بن، ئەوا لەپێناسەکردن‌و لەناساندنی جۆرەکانی ئازادیدا بەگشتی‌و لەبەرامبەر ئازادی ڕادەربڕیندا دیدگای جیاوازیان هەیە. چونکە مەسەلەی ئازادی ڕادەربڕین ئەگەرەکانی بەریەککەوتن‌و پێکدادان نزیك دەکاتەوە. هاوکات لەگەڵ باسکردنی ئازادی ڕادەربڕیندا باس لەدیاریکردن‌و دانانی سنورو هێڵی سورو شتەکانی دیکە

دەکریٚ، بەجۆرێك وەك دەوترێ:" سنوری ئازادی رادەربڕین لەمەسەلە هەستیارەکان دادەنرێت، بەشێوەیەك ئەو سنورەی دەوڵەتان یاخود کۆمەڵەو گروپەکان بۆ ئەو ئازادییەی دەکێشن بەگوێرەی رەوشی ئەمنیو ریٚژەی دانیشتووانو رەگەزو تایفە ئاینیە جیاوازەکان دەگۆڕێت، کەلەچوارچێوەی ئەو دەوڵەتە یاخود ئەو کۆمەڵەیەدا دەژین".(4)

لەلایەکیترەوە(عەلی حەرب) باس لەوە دەکات کەقسەکردن لەبارەی ئازادی رادەربڕینەوە، چوونە ناوەوەیە بۆناو کێڵگەی مین، بەتایبەت ئازادی نوسینو رادەربڕین. بیرکردنەوەش لەکۆتاییدا بریتییە لەتێپەڕاندنی سنورەکان.(5) چونکە ئەو بڕوای وایە کرۆکی گرفتەکە بریتیە لەئازادی بیرکردنەوەو ئازادی رادەربڕین.(6)

هەروەها لەشوێنێکیتردا ئەوە هاتووە کە ئازادی بۆخۆی بریتییە لەتوانای مرۆڤ بۆپیادەکردنی هەڵبژاردنی ئازاد، بۆگوتنو کردنو ئەنجامدانی ئەو شتانەی بەراستیان دەزانێ، بەبێ توانای هەڵبژاردنی ئازاد هیچ مانایەك بۆچەمکی ئازادی نامێنێتەوە"(7). لەلایەکیترەوە(بەختیار عەلی) باس لە پەیوەندی نێوان ئازادیو ئازادی رادەربڕین دەکاتو دەبێژێت:" مەرج نییە، مرۆڤ دابنیشێت دەربارەی ئازادی بنوسێ، بەڵکو دەشێت هەر کردارێکی ئازاد بێت کەتەعبیر لەو ئازادیە دەکات. مرۆڤ ئازادە لەوەی ئازادی خۆی بەچ زمانێك دەهێنێتە قسە، بەڵام ئازاد نییە لەوەی تەعبیری لێنەکات، نەبوونی

تەعبیر نیشانەی نەبوونی ئازادییــە، لەراســتیدا ئــازادی بــەبێ ئاماژە بوونی نییە، ئازادی لەتەعبیر جیاناکرێتەوە..."[8].

هەروەك دەشێ مافی ئازادی رادەربڕین بۆهەمووان وەك یەکێك لەرێسا بنەڕەتییەکانی مافی مرۆڤ لەقەڵەم بــدەین.[9] چــونکە لەدونیای هاوچەرخدا مافی ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بەئازادیو بێ ترس قسە بکات، یەکێکە لەمافە هەرە سەرەکییەکانی بــوونی مــرۆڤ. تاکەکــەس بۆئــەوەی بتوانێــت بــوونی خــۆی وەك بونەوەرێکی مرۆیی ئەزموون بکات، دەبێت بتوانێـت ئازادانــە قسە بکات، بەبێ تــەعبیرکردنی ئــازاد مانایــەکی ئــەوتۆ بــۆ سەربەخۆیی تاکەکەسی نامێنێتەوە.[10] هاوکات گرنگە ئاماژە بۆئەوەش بکــەین کــەئازادی رادەربــڕین بــەگرنگترین ئازادییــە بنەڕەتییەکانی مرۆڤ دادەنرێت، بەجۆرێك مرۆڤ هیچ بەهایەکی نییــە، کاتێــك ئــازادی گوزارشــتکردن لــەبیروڕای خــۆی ون دەکات.[11] واتە لێرەوە تێدەگەین ئازادی قســەکردنو ئــازادی روانینو گوزارشتکردن مــافێکی ســەرەتاییو گرنگــی مرۆڤــەو لەمافەکانی تر هەرگیز نــاتوانرێ جیابکرێتــەوە. گرنگــە بــاس لەوەش بکەین کەسنوری ئازادی رادەربڕین بەگوێرەی پێناســەو بەگوێرەی روانینە جیاوازەکان دەگۆڕێــت، بــەجۆرێك پــەراوێزی ئازادی رادەربڕین فراوان دەبێ یان بەرتەســك دەبــێ بــەگوێرەی گۆڕانی هاوسەنگی هێزە سیاسیو کۆمەڵایەتییەکان، هــەروەها بـــــەگوێرەی پێشـــــکەوتنی سیســـــتمی فـــــەرمانڕەواییو کۆمەڵگەکان.[12]

دەتوانین بڵێین ئازادی ڕادەربڕین لەکۆڵەکە بنەڕەتییەکانی دیموکراسی دەژمێردێت.(13) هەرگیز ناگونجێ لەدەوڵەتو سیستەمو کۆمەڵگەیەکی تۆتالیتاریو دیکتاتۆریدا باس لەبوونی ئازادی بەگشتیو ئازادی ڕادەربڕین بکەین. بۆیە بەگەشەکردنو فراوانبوونی سیستمی دیموکراسیو کرانەوەی سیاسی بەهەمان شێوەش ئازادیو ئازادی ڕادەربڕینیش گەشە دەکاتو فراوان دەبێت. بەڵام ئەوکاتەی پێناسەی جیاواز بۆ ئازادیو ئازادی ڕادەربڕین دەکرێ کەدیدگای جیاوازو ڕوانینی جیاواز و بەخشینی شوناسی جیاواز بۆئازادیو ئازادی ڕادەربڕین هەیە، واتە لای هەندێ ئازادی سنوری دیاریکراوی نییەو لای هەندێکی تر دەبێ ئازادی سنوردار بکرێت. فەیلەسوفی بەناوبانگ(برتراند راسل) لەبارەی پێناسەی ئازادییەوە دەڵێت:" ئازادی واتە نەبوونی ڕێگر لەبەردەم دەستەبەر کردنی ئارەزووەکاندا".(14)

لەپێناسەیەکی تردا بۆئازای هاتووە کە"ڕزگاربوونی مرۆڤە لەبەندایەتی برا مرۆڤەکەیو ڕزگاربوونی گەلانە لەبەندایەتی گەلانی تر".(15) هەروەها ڕەنگە هەموان هاوڕابن لەوەدا کەئازادی بریتییە لەنەبوونی زۆرلێکردنو کۆتو پێوەند کەلایەکیتر دەیسەپێنێت. مرۆڤی ئازاد بریتییە لەو مرۆڤە بەتوانایەی کەدەتوانێ ئامانجو ڕێگەی خۆی دەست نیشان بکات، واتە ئازادی بریتیە لەنەبوونی زۆرلێکردنو بوونی ئازادی دەست نیشانکردن.(16)

باسی دووەم(چەمكو پێناسەی ئازادی رادەربڕین)

چـڕبوونەوەی خـاڵی نـاكۆكیو نزیكبوونـەوەی ئەگـەرەكانی بەریەككـەوتنو پێكـدادانی نێـوان هێـزە كۆمەڵایەتییـە جیاوازەكان بەبڕوای ئێمە رەنگە زیاتر لەپێناسەكردنو ناساندنی چەمكی ئازادی بەگشتیو ئازادی رادەربڕینەوە بێـت، چـونكە هەر لێرەوە پێویسـتی رەهـاكردنی ئـازادی رادەربـڕین یـاخود سنوورداركردنو دیسپلینكردنی دێتە ئاراوە. رەنگە لەسـادەترین پێناسەدا ئازادی رادەربڕین بریتی بێت لەئازادی گوزارشـتكردن لەبیروبۆچوونو بیروڕا لەرێگەی قسەكردن یان لەرێگـەی نوسـین یـاخود كـارێكی هونەرییـەوە، بـەبێ سانسـۆر یـان كـۆتو پێوەندێك.[17] بەڵام لێرەدا جەدەلێك دێتە ئـاراوە بـەوەی ئایـا ئازادی بەگشتیو ئازادی رادەربڕین سنوری دیاریكراوی هەیـە؟ ئایا ئازادی كەسێك مایەی نەخوێندنەوەو پێشێلكردنی ئازادی ئەوانیترە؟ ئایا دەكرێ ئازادی سنووردارو كۆتو پێوەند بكـرێ؟ بۆیە ئەمـە رەنگـە كرۆكـی پێكـدادانو بەریەككـەوتن بێـت. بێگومان لەسەرووی هەموانـەوە فەیلەسـوفی گـەورە(كانـت) لەبارەی ئازادییـەوە دەڵێـت:" مـرۆڤ تائـەو چـركەیە ئـازادەو ئازادی هەیە، كەئازادی كەسێكی تر یان ئازادی بەرامبەرەكەی دەست پێدەكات"، واتە بەدەستپێكردنی ئازادی بەرامبەرەكـەم ئیدی ئازادی من كۆتایی دێتو سنووردار دەبێت.

لێرەدا(مەریوان وریا قانیع) دەبێژێ:" ئـازادی بـەمانای ئـەوە دێت کەمرۆڤ بتوانێت ئەو شتانە بکات کەدەخوازێت بیانکات، بێگومان باسـکردن لـەئازادی بـەم رەهاییـە ناڕاسـتەو سـنور بۆدانـانی پێداویستسـییەکی گەورەیـە، بـەڵام ئـەوەی سـنور بۆئازادی دەکێشێت دەبێـت خـودی ئـازادی خـۆی بێـت".[18]

مەریوان ئەوەش دەڵێت کە پیادەکردنی ئازادییەکانی من نابێت ببێتە هۆی پێشێلکردنی ئازادی کەسێکی دیکە.[19]

لەبارەی ئازادی رادەربڕینیشەوە کەجۆرێکی گـرنگو بنـەڕەتی ئازادییە، ئەوا باس لەوە دەکرێ کـە کاتێـك دەتـوانرێ سـنور بۆئازادی رادەربڕین دابنرێ کەئەو ئازادی رادەربڕینـە ئـازادی کەسـانی تـر پێشـێل بکـات. لای فەیلەسـوفی مـەزن(جـۆن سـتیوارت میـل) ئـەوەی کەتاکـە سـنورە لەبـەردەم ئـازادی رادەربڕیندا بریتیە لەچەمکی زیان گەیانـدن بەکەسـێکیتر[20].

بەڵام تائێستاش جەدەلو گفتوگـۆو بەریەککـەوتنو پێکـدادان لەسەر ماهییەتو چەمكو پێناسەی ئەو زیانە گەیاندنە هەیە.

جۆن ستیوارت میل دەڵێت:"ئەگەر هاتوو هـەموو مرۆڤایـەتی خاوەنی یەك بیروڕا بـن، تـەنیا یـەك کـەس هـەبێ کـەخاوەنی بیروڕایەکی جیاوازبێت، بێدەنگ کردنی ئـەم تاکەکەسـە هـیچ جیاوازییەکی نییە لەوەی کەئەم یەك کەسە هەستێت بەبێدەنگ کردنی هەموو مرۆڤایەتی، ئەگەر هاتوو هێزی بۆ رەخسا".[21]

بەمانایەکیتر ئازادی رادەربڕین مافی تۆمەتبارکردنو ناوزڕاندن نابەخشێتو رێگەی پێنادات.[22] واتە ئەگەر ئازادی رادەربڕین مافی رەخساندنی ئازادی قسەکردنو نوسـینی بەخشـی بـەتۆ،

ئـەوا نـابێ ئـەم مافـە لەهەمانکاتـدا مـافی ناوزڕانـدنو سـوکایەتیکردنو تۆمـەتبارکردنی کەسـانی تـرو کـۆڕو کۆبوونەوەمکانی ترت پێ ببەخشێ و ئـازادی ئـەوان پێشـێل بکەیت. بەمانایەکیتر ئازادیو ئـازادی ڕادەربـڕین بۆخۆیشـی مافـەو لەهەمانکاتـدا لێپرسراوێتیشـی هەیـە، بەتایبـەت لەبەرامبەر پاراستنو لەبەرامبەر بێبایەخ سەیرنەکردنی ئـازادی ئەوانیتردا. بەڵام وەك وتمـان قسـەی جیـاواز لەسـەر چـەمكو مانای زیان گەیاندن هەیە، بـەجۆرێك ڕەنگـە ئـەو قسـەکردنە ئازادەی بەمانای ڕادەربڕینـی ئازادانـە، پێدەچـێ لای کـەسو گـروپو هێزێکـی کۆمەڵایـەتی تـەنها وەك پیـادەکردنێکی ئاسایی مافێك بێت لەمافەکان، بەڵام هەر ئەم ئازادیو ئازادی ڕادەربڕینە دەشێ بەمانای زیان گەیانـدن لای کـەسو گـروپو هێزی کۆمەڵایەتی دیکە بکەوێتەوەو لێکبدرێتەوە.

سـەبارەت بـەدانانی سـنور بۆئـازادیو ئـازادی ڕادەربڕینیش(مەریوان وریا قانیع)لەوتارێکیدا دەڵێـت:" هـیچ شـتێك هێنـدەی بیرکردنـەوە لـەدانانی سـنورێکی مـاقوڵ بۆقسـەکردنی ئـازاد زەحمـەت نیـە، ئـەوەی کەسـێك بەقسـەکردنێکی خـراپو بـێ مانـاو زیانبەخشـی دەزانێـت، دەشێت کەسێکی دیکە وەك شتێکی ئاساییو سـەرنج ڕاکـێش ببینێـت". [23] بۆیـە هـەم پێناسـەکردنی چـەمکی ئـازادیو ئازادی ڕادەربڕین لەنێوان هێـزە کۆمەڵایـەتیو سیاسـییەکاندا جیـاوازە، هـەم مەسـەلەی دیـاریکردنی سـنور بۆئـازادی ڕادەربڕینیش جیاوازە، چونکە دواجار هەردوولا لەسەر چەمکی

زیـان گـەیانن دیـدگاو روانینیـان جیـاواز دەبێـت لەیـەکتری. بەواتایەکیتر رەنگە لەبیرکردنەوەی ئاینیو ئیسلامیدا چـەمکی زیان گەیاندن تاڕادەیەکی زۆر پەیوەندی بەبەزاندنو تێپەڕاندنی سنورە شـەرعییەکانو ئـادابی ئیسـلامییەوە هـەبێت، یـاخود ئەوکاتە پێویستە سنور بۆئازادی رادەربڕین دابنرێـت کـەخودی ئازادیو ئازادی رادەربڕینو ئازادی قسەکردن تـەجاوز دەکاتـە سەر بابەتە موقەدەسەکان، کەزۆرجار تەنها خودی ئاینو دەقـە ئاینییـەکان نـین کەموقـەدەسو پیرۆزبـن، بـەڵکو لەهەنـدێ کۆمەڵگەو لای هەندێ هێزی کۆمەڵایـەتیو ئـەتنیو سیاسـی زۆر شتی دیکەش هێڵی سورەو بەزاندنو قسـە لەسـەر کردنـی وەك قسە کردن لەموقەدەسو هێڵی سورو بڤە وایـە. بۆنموونـە لەسیسـتەمو هێـزە تۆتالیتـاریو دیکتاتۆرییەکانـدا قسـەکردن لەئازادی بۆخۆی هێڵی سورە، یاخود لەهیندستان قسـە وتـنو بەخراپ وێناکردنی گیانداریکی وەك مانگا رەنگە کارەساتێکی گەورەی مرۆیی بەدوای خۆیدا بهێنێت. ئەوەی بەگشتی تێبینی دەکرێ ئەوەی کەلەکۆنەوە تائێستا پانتاییە قەدەغەکان، یاخود هێڵە سورەکانی نێو کۆمەڵگە کـەزۆرجار قسـە لەسـەرکردنیان بۆتـــە مایـــەی بەریەککـــەوتنو پێکـــدادانی تونـــدی هێـــزە کۆمەڵایەتیو سیاسییەکان بریتـی بـووە لـەپانتایی(سـێکسو ئـاینو دەسـەڵات).[24] بۆیـە ئەگـەر تـەنها بڕوامـان وابێـت کەقسەکردن لەسـەر ئـاینو سـیمبۆڵە موقەدەسـەکانی هێڵـی سوربوونو قەدەغەو بڤە بـوون، ئـەوا هەڵەیـەکی مەنهـەجیو زانستی دەکـەین، بـەڵکو زۆر شـتی وەك سـێکسو دەسـەڵات

بەتایبەت لەکۆمەڵگەکانی رۆژهەڵاتدا لەلایـەن گـروپ‌و هێـزە کۆمەڵایەتی‌و سیاسییەکانەوە وەك پانتایی موقـەدەس‌و هێڵـی سور وێناکراون. لـەمڕووە کـوژرانی رۆژنامەنوسـی لاو(سـۆران مامـە حەمـە)بەرپرسـی نوسـینگەی گۆڤـاری(لڤـین)لەشـاری کەرکوك‌و لەبەردەم ماڵەکەی خۆیدا بـەگوێرەی لێکدانـەوەکان‌و بەگوێرەی زۆر راپۆرتی بیانیش هۆکارێکی زۆری تیرۆرکردنەکەی لەسەر هەندێ لەو راپۆرتانە بووە کە لەسەر سێکس‌و دەسەڵات لەگۆڤاری ناوبراودا بڵاوی کردوونەتەوەو هەر بەگوێرەی زۆربەی لێکدانـــەوەکانیش لەلایـــەن دەســـتێکی رەشـــی تیرۆریســـتی کوردییەوە خـوێنی ئـەو رۆشـنبیرو نوسـەر لاوە ئەکتیڤیسـتە حەڵاڵکراوە. تەنانەت یەکێك لەرۆژنامە بیانییەکان راپۆرتێکی لەســـەر تیرۆرکردنـــی نـــاوبراو بڵاوکـــردەوەو لەگەڵیشـــیدا ئـــەو راپۆرتـــەی بڵاوکردبـــۆوە لـــەژمارە(69)ی گۆڤـــاری لڤینـــدا بڵاوکرابۆوە کە(سۆران مامە حەمە) لەسەر لەشفرۆشی لەشاری کەرکوکدا ئەنجامی دابوو. کەرەنگە هەموو تاوانەکەی ئەوەبێت کەباجی وشـەی ئـازادو نوسـینی ئـازادو ئـازادی قسـەکردن‌و ئازادی رادەربڕینی دابێت. کەلەم وڵاتەدا وەك مۆدێلی وڵاتێکی رۆژهەڵاتی دواکـەوتوو قسـەکردنی ئـازادو ئـازادی رادەربـڕین باجی هەیە، کەئەویش خوێنەو سۆران مامە حەمـە رووبـەکی گەش‌و نەمریی لەبـەرز راگرتنـی ئـازادی رادەربـڕین‌و ئـازادی قسەکردنی بۆخۆی تۆمارکرد، کەئەوەش رێزو پلـەو پایەیەکـە هەموو کەس ناتوانێ دەستی خۆی بخات‌و بگرە زیادەڕەوی نییە گەر بڵێین پایەی سۆران لەبەرامبەر قوربانیدا لـەپێناوی وشـەی

ئازادی‌و ئازادی رادەربڕینـدا هیچـی کـەمتر نـەبێت لەپایـەی ژمارەیـەکی زۆر لـەو رۆشـنبیرو رووناکبیرانـەی سـەردەمی رێنیسانسی ئەوروپی‌و رەوتی رۆشنگەری رۆژئـاوا کەبـەخوێنی خۆیان ئازادی‌و ئـازادی قسـەکردن‌و رادەربڕینیـان پێشکەشـی مرۆڤایەتی کرد لەدوای خۆیان.

بۆیە قسەکردن لـەبارەی ئـایین‌و سـێکس‌و دەسـەڵاتەوە بـاجی لەدواوە بووەو هەر بکەرێك ئەگـەر لای خۆیـەوە مومارەسـەی ماف‌و پرەنسیپی ئازادی رادەربڕینی پـەیڕەوکردبێت، ئـەوا لای بەرامبەرەکـەی بەزەندەقـەو ناپـاك‌و بـەکرێگیراوو بێبـاوەڕو تۆمەتی هاوشێوەی تر تۆمەتبارو تاوانبار کراوە.[25]

باسی سێیەم(مێژووی سەرهەڵدانی ئازادی‌و ئازادی رادەربڕین)

لەراستیدا ئازادی بەگشتی‌و ئازادی رادەربـڕین بەتایبـەت لای مـرۆڤ، مێژوویيـەکی دوورو درێـژی هەیـە، چـونکە مـرۆڤ بونەوەرێکی قسەکەرە، پاشان لەگەڵیشیدا مـرۆڤ بونـەوەرێکی راڤەکەرەو شتەکان بەشێوەی جیـاواز لێکدەداتـەوە.[26] بۆیـە لەکاتی دەربڕین‌و راڤـەکردنی مرۆڤـدا بـۆ بونـەوەرو شـتەکان رووبـەڕووی کـۆت‌و پێوەنـدکردن‌و سـنوردار کـردن دەبێتـەوە. ئەگەرچی خۆیشـی بـەئازادی لـەدایکبوبێت. بێگومـان هـەم لەمێژووی بیرکردنەوەی ئاینی‌و هەم لەمێژووی فیکری سیاسـی رۆژئاوادا، ئازادی‌و ئازادی رادەربڕین مێژوویيـەکی دیـاریکراوی دوورو درێـــژی هەیـــە، بـــەجۆرێك خەلیفـــەی دووەمـــی راشیدین(عومەری کوڕی خەتتاب) لەوتەیەکیدا دەڵێت:" چـۆن

مرۆڤـەکانتان کردۆتـە کۆیلـە، لەکاتێکـدا ئـەوان بـەئازادی لـەدایکبوون". [27] یـاخود فەیلەسـوفی گـەورەی سـەردەمی رۆشنگەری(جان جـاك رۆسـۆ)دەڵێـت:" مرۆڤـەکان بـەئازادی لـەدایکبوون، بـەڵام لەهـەموو شـوێنێك بـەکۆتو پێوەنـد بەسـتراونەتەوە". [28] بۆیـە ئەگـەر جـارێ سـەیری مێـژووی ئیسلامی بکەین، تێبینی دەکەین کەنەك هەر خەڵکی ئاساییو مرۆڤـە رەشو رووتـەکان کراونەتـە کۆیلـەو ئازادییـان لێسەنراوەتەوە، بەڵکو چەندین زاناو پێشەواو کەسی پایەبـەرز لەرووی ئاینی ئیسلامو شـارەزاییو لەخواترسـانییەوە لەلایـەن فەرمانڕەواکانو گروپە سیاسیو کۆمەڵایەتیو مەزهەبییەکانی نێو ئاینی ئیسلام خۆیەوە کۆتو پێوەندکراونو رێگـە نـەدراوە هەم ئازادی خۆیان مومارەسە بکـەن وەك مـافێکی خـوداکرد، هەم مافی ئازادی رادەربـڕینیش مومارەسـە بکـەن لـەپێناوی بڵاوکردنەوەی بیروڕاو بۆچوونە ئاینیو ئیسلامییەکانیاندا.

تەنانەت ژمارەیەکی زۆر لەو زاناو کەسـایەتیە ئیسـلامییانە لەسـەر بـیروڕاو بۆچـوونەکانیانو لەسـەر ئـازادی قسـەکردنو ئازادی رادەربڕینیان زیندانیکراونو سزای دەروونیو جەسـتەیی زۆر توند دراون، وەك زیندانیکردنو ئازاردرانی ئیمام ئەحمـەدی کوڕی حەنبەل لەسەر کێشەی(خلق القران)لەسەر دەمی خەلیفە مەئمونی عەبباسسیداو چەندان نموونەی تریش. ئەگەر بڕوانینە مێژووی شارستانێتی رۆژئاواش، ئەوا تێبینـی ئـەوە دەکـەین، کەلەسـەدەکانی ناوەڕاسـتدا هـەژمموونی دەسـەڵاتی کەنیسـەو ئاینی مەسیحییەت بەسەر کۆی بوارە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی

ئەورووپییەوە بەئاشکرا بوونی هەبووە. هەروەها کێشەی ئازادی رادەربڕینو ئازادی قسەکردن بەئاشکرا سەریهەڵداوەو هەموو ئەو کتێبو نوسراوانەی کەلەدەرەوەی جیهانبینیو راڤەی کڵێسای مەسیحییەت بوون لەناوبراونو سوتێنراونو نوسەرانو رۆشنبیرانیشیان راپێچی دۆزەخی کەنیسە کردووەو کەسانی وەك گالیلۆو کۆپەرنیکۆس بوونەتە قوربانیو سوتەمەنی ئاگری قەدەغەکردنی بیروڕاو ئازادی رادەربڕین.

ئەگەر بڕوانینە سەرهەڵدانی مێژووی ئازادی رادەربڕین لەرۆژئاوا، تێبینی ئەوە دەکەین کەسەرەتاکانی چەمکی نوێی ئازادی رادەربڕین لەبەریتانیا بۆدوای ئەو شۆڕشە دەگەڕێتەوە کەکۆتایی بەدەسەڵاتی(جیمسی دووەم)ی پادشای ئینگلتەرا هێنا لەساڵی(1686)و هەریەکە لە پادشا(ولیەمی سێیەم)و شاژنە(ماری دووەم) لەئینگلتەرا لەسەر تەختی دەسەڵات دانرانو پاش ساڵێك لەوە پەرلەمانی بەریتانیا یاسای ئازای قسەکردنی لەپەرلەماندا دەرکرد.[29]

هاوکات لەفەرەنساش پاش چەند دەیەیەك لەململانێ، توانرا جاڕی مافەکانی مرۆڤو هاوڵاتی لەو وڵاتە لەدوای سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسییەوە لەساڵی(1789) بدرێ، بەجۆرێك جاڕنامەکە ئەوەی تێدا هاتووە کەئازادی رادەربڕینو بیروڕا بەشێکی بنەڕەتییە لەمافەکانی هاوڵاتییان.[30] لەویلاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش چەند هەوڵێك هەبوو بۆئەوەی ئازادی رادەربڕینو بیروڕا ببێتە مافێکی بنەڕەتی، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرکەوتوو نەبوو لەپراکتیك کردنی

ئەوەی کە لەدەستورەکەی هەردوو سـاڵی(1776و 1778)دا هاتبوو دەربـارەی ئـازادی رادەربـڕین، بەشێـوەیەك ئـەم بەنـدە سڕایەوە لەساڵی(1798)و سزای قورسیشی بۆدانرا.[31] بـەڵام پاش چەندین گۆڕانکاری ئێستا ئازادی رادەربـڕین لەئـەمریکا فراوانبووەو مـافێکی بنـەڕەتیو سروشـتی هاوڵاتیانـە، بـەڵام لەگەڵ سنورو چوارچێوەی یاسایی خۆیدا. یەکەمین کەسـێکیش کەبانگەشەی بۆئازادی رادەربڕینو ئـازادی قسـەکردن کردبێـت بریتییە لەفەیلەسوفو بیریاری بەناوبانگ(جۆن ستیوارت میل) کەلەبیروڕاکانیدا ئازادانە بەرگری لە ئازادی رادەربڕین کردووەو بەمافێکی سەرەکی مرۆڤیشی داناوە.

پەراوێزەکانی بەشی یەکەم

1. بەختیار عەلی: دەربارەی عەقڵی ئازاد، لەوەڵامی پرسیاری خوێنەرێکدا دەربارەی وشەی(ئازاد) لەگوزارەی(ڕۆژنامەی ئازاد)دا، بڕوانە ماڵپەڕی بەختیار عەلی http://www.bachtyar-ali.com/new_writing.php?subject=1-1.
2. هەمان سەرچاوە.
3. مەریوان وریا قانیع: شوناس و ئاڵۆزی، چەند وتارێك دژ بەدۆگماتیزم، چاپی یەکەم،چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی،2004،لا(169).
4. سەلام عەبدولکەریم: دەربارەی ئازادی بیروڕا و ڕادەربڕین، ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(4258)شەممە(2007/5/3).
5. علی حرب: وتاری(حقول الالغام، الاسئلة المقموعة والاجوبة المرجاءة)، لەکتێبی(مابعد ذهنیة التحریم)جلال صادق العظم،ص(552).
6. هەمان سەرچاوە،لا(556).
7. مەریوان وریا قانیع: ئازادی و چاوساغەکانی، ماڵپەڕی ڕۆژنامەی(ئاوێنە)، http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=19
8. بەختیار عەلی: دەربارەی عەقڵی ئازاد....... سەرچاوەی پێشوو.

9. د.عبدالرحمن الحبيب: حرية التعبير وحق التخوين والتكفير، www.al-jazeerah.comsa/2008jaz/apr/7/ar3.htm

10. مەریوان وریا قانیع: قسەکردنی ئازاد، ماڵپەڕی ڕۆژنامەی(ئاوێنە)، http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=87

11. د.نظام عساف: مدخل الى حقوق الانسان، عمان،1999،ص(273).

12. سفيان بن حميدة: حرية الراى والتعبير فى المفهوم، ص(13).

13. د.عبدالحليم موسي يعقوب: حرية التعبير الصحفى فى النظم السياسية العربية،ط(2003)، عمان-اردن، دار مجدلاوى للنشر والتوزيع، ص(62).

14. عبدالوهاب الكيالَى: الموسوعة السياسية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت،1979،ص(244).

15. ا.د.الخياط: الحرية السياسية فى الاسلام بين الخصوصية والعالمية، بحث منشور ضمن بحوث حقوق الانسان فى الاسلام،(109).

16. د.عبدالرحمن الحبيب: حرية التعبير وحق..........،المصدر السابق.

17.سەلام عەبدولکەریم: دەربارەی ئازادی بیروڕاو رادەربڕین......سەرچاوەی پێشوو.
18.مەریوان وریا قانیع: ئازادی‌و چاوساغەکانی.....، سەرچاوەی پێشوو.
19.هەمان سەرچاوە.
20.سەلام عەبدولکەریم: دەربارەی ئازادی بیروڕاو رادەربڕین......سەرچاوەی پێشوو.
21.هەمان سەرچاوە.
22.د.عبدالرحمن الحبيب: حرية التعبير وحق.........،المصدر السابق.
23.مەریوان وریا قانیع: قسەکردنی ئازاد.....، سەرچاوەی پێشوو.
24.وتاری محمد میر احمد: العقل والرصاص، الادمغة بين محكمة الظلام وازمنة الهلام، لەکتێبی(مابعد ذهنية التحريم)جلال صادق العظم،ص(455).
25.نفس المصدر،ص(456-458).
26.مەریوان وریا قانیع: قسەکردنی ئازاد.....، سەرچاوەی پێشوو.
27.د.محمد عابد الجابری: الديمقراطية وحقوق الانسان، سلسلة الثقافة القومية، قضايا الفكر العربی(29)، مركز دراسات الوحدة العربية-مصر،ط3،بيروت،2004،ص(175).

28.د. فوزی البدوی: المحنة وحرية التفكير الدينی فی الاسلام الكلاسيكی، مجلة(العربية)لحقوق الانسان،عدد(4)فبراير(1997)،ص(32).

29.سەلام عەبدولكەریم: دەربارەی ئازادی بیروڕا و ڕادەربڕین......سەرچاوەی پێشوو.

30.هەمان سەرچاوە.

31.هەمان سەرچاوە.

بەشی دووەم(ئازادی‌و ئازادی رادەربڕین لەدیدگاو روانینە جیاوازەکانەوە)

**"مرۆڤ ئازادە لەوەی ئازادی خۆی بەچ زمانێک دەهێنێتە قسە، بەلاَم ئازاد نییە لەوەی تەعبیری لێنەکات"**
**بەختیار عەلی**

بۆئەوەی لەجۆرو شێوازو ئاستو چۆنێتی بەریەککەوتنی کەس‌و گروپ‌و هێزە کۆمەلاَیەتی‌و سیاسییەکانی کوردستان لەمەڕ ئازادی‌و ئازادی رادەربڕین تێبگەین، پێویستمان بەناسینی چەمکەکانی ئازادی بەگشتی‌و ئازادی رادەربڕین هەیە لەدیدگا جیاوازەکانەوە، بەجۆرێك لەگەلَیشیدا پییێویستمان بەناسینی چەمکی زیان گەیاندن هەیەن کە لێرەوە دەتوانین هێلَەکانی پێکدادانی نێوان ئەو هێزانەمان بۆروون ببێتەوە.

راستە هەموولایەك تاڕادەیەکی زۆر بڕوای بەئازادی‌و ئازادی رادەربڕین هەیەو بەپێویستی‌و مافی سەرەکی مرۆڤەکانیشی دەزانێت، بەلاَم هەموو ئەم بڕوابوونانە پەیوەستە بەدیدگاو روانینی تایبەتی خۆیانەوە بۆئەو چەمکانە. هەر لێرەشەوە ئەگەرەکانی بەریەککەوتن‌و پێکدادان‌و هەندێ جاریش گفتوگۆ دێنێتە کایەوە.

بێگومان ناساندنی چەمکی ئازادی‌و ئازادی رادەربڕین لەدیدگا جیاوازەکانەوە کارئاسانی گەورە دەکات لەوەدا کەچ کاتێك پێویستە ئازادی رادەربڕین رێکبخرێ‌و سنوری بۆدابنرێ‌و

لەلایەکیتریشەوە چ کاتێ پێویستە ئەو کۆتو پێوەندانە لابرێ کەرێگرو بەربەستن لەبەردەم ئازادییو ئازادی ڕادەربڕیندا.

باسی یەکەم(دیدگای ئاینیو ئیسلامییانە بۆئازادیو ئازادی ڕادەربڕین)

"چۆن مرۆڤەکانتان کردۆتە کۆیلە،

لەکاتێکدا ئەوان بەئازادی لەدایکبوون"

عومەری کوڕی خەتتاب

گومانی تێدانیە کەلەئاینی ئیسلامدا پانتاییەکی گەورە بۆقسەکردن لەسەر ئازادی بەگشتیو سەرجەم ئازادییەکانی دیکەش تەرخاکراوەو وەك مافێکی بنەڕەتیو سەرەکیو سروشتیو خوداکرد بۆمرۆڤ پێناسەکراوە. بەجۆرێ ڕەنگە هەڵە نەبین گەر بڵێین چەمکی ئایین بەگشتیو چەمکی ئیسلام لەبنەڕەتدا هەڵگری چەمکی ڕزگاریو ئازادبوونی مرۆڤەکانە، بەڵام بێگومان ئاینی ئیسلام وەك پەیامێکی گەردوونی گەورە جگەلەوەی تەعالیمو زانیارییە، هاوکات شەریعەتو تەشریعو بەرنامەشە. لەم نێوەندەدا یاسای تایبەت بەئازادیو ئازادی ڕادەربڕینی هەیە. دەبێ ئەوەش بڵێین کەلەناو جیهانبینی ئاینیو ئیسلامیدا بیروڕای جیاواز لەسەر ئەو دوو چەمکە هەیە تاڕادەیەکی زۆر، ئەمەش بەحوکمی بوونی فرە لێکدانەوەی دەقەکانی قورئانو فەرمودەو ئیجتیهادی

شەرعزانەکان‌و زانایـانی ئـاینی ئیسـلام لەکۆنـەوە تائـەمڕۆ. لەولاشـەوە ئـەم بـیروڕاو جیاوازییـە پەیوەنـدی بەئاسـتەکانی کرانەوەو داخرانی گوتـاری ئـاینی‌و ئیسـلامی خۆیـەوە هەیـە لەبەرامبەر ئازادی‌و ئازادی ڕادەربڕیندا، بەتایبەت لەسەردەمی نوێـدا بیرکردنـەوەو ڕوانینـی نـوێ هـەم بۆئـاینی ئیسـلام‌و دەقەکانی‌و کێشە هاوچەرخەکانی ژیان هەیە، هەم ڕوانینی نوێ بۆ ئەرك‌و ماف‌و ئازادییە گشتییەکانی مرۆڤ هەیـە. ئەمـەش لەشوێنێکەوە بۆشوێنێکی تـرو لـەگروپ‌و کـەس‌و هێزێکـەوە بـۆهێزێکی تـرو تایەفەیـەکی ئـاینی بۆیـەکێکی تـرو لەسەردەمێکەوە بۆسەردەمێکی تر دەگۆڕێت‌و جیاوازە.[1] هەر بۆنموونە بیرکردنەوەی بەشێکی زۆر لەباوەڕداران‌و مسـوڵمانانی نیشتەجێ ئەوروپاو ڕۆژئاوا جگە لەمەسەلەکانی خواپەرسـتی‌و عیبادات، بـەڵکو لـەکاروباری ڕۆژانـەو هەڵسـوکەوت‌و شـتە دونیاییەکاندا واتە لـەبواری موعامەلاتـدا جیـاوازەو ڕوانـین‌و لێکدانـــەوەو شـــێوازی مامەڵـــەکردن‌و جێبـــەجێکردنی تەعالیمەکانی ئاینی ئیسلامیشیان جیـاوازە لـەو مسـوڵمان‌و باوەڕدارانەی تر کە لەرۆژهەڵات یاخود لەچوارچـێوەی جیهـانی ئیسلامیدا دەژین‌و نیشتەجێن.

هەروەك ڕەنگە خوێندنـەوەو ڕاڤـەکردن‌و لێکدانـەوەی ئـاینی‌و ئیسلامییانەی باوەڕدارێکی خوێنـەوار یـان نوسـەر بەتایبـەت لەبواری کاروبـاری ڕۆژانـەو موعامـەلات‌و بەتایبـەتی تـریش لەمەڕ مەسەلەکانی ئازادی‌و ئـازادی ڕادەربـڕین جیـاواز بێـت لەڕوانین‌و لێکدانەوەو ڕاڤەی مامۆسـتایەکی ئـاینی. ئەمـەش

پەیوەنـدی بەتایبەتمەنـدێتی کۆمەڵایەتییـەوە هەیـە لەلایـەك، لەلایەکیتریشـــەوە پەیوەنـــدی بـــەجۆری خوێنـــدنو زانســـتی هـــەردووڵاوە هەیـــە، واتـــە خوێنـــدنی بـــاوەڕداره ڕۆشـــنبیرو خوێنەوارەکە خوێنـدنو زانسـتێکی نـوێو مۆدێرنـەو ئـەوەی مامۆستا ئاینیەکـەش خوێنـدنی حـوجرەو مزگـەوت. لێـرەدا مەبەستمان روونکردنەوەی جیاوازییەکانـە نـەك خوانەخواسـتە بەخراپ باسکردنی لایەكو بەباش باسکردنی ئەوی تر. بۆ ئـەم مەبەستەش (رێبین ئەحمەد هـەردی)پەنجـە دەخاتـە سـەر ئـەم راسـتیەو دەڵێـت:"خوێنـدکارێکی زانکـۆ کەزانسـتی تـازەی خوێنـدووە، تەفسـیری بـۆرووداوو پێشـهاتەکان جیـاوازە لـەو کەسـەی خوێنـدەواری حـوجرەی خوێنـدووەو جیاوازیشـە لـەو کەسەی هیچی نەخوێندووە...".[2] بەهـەرحاڵ لێـرەوە گرنگـە قسە لەسەر روانینو جیهانبینی ئـاینیو ئیسـلامییانە بکـەین بۆئازادیو ئازادی رادەربڕین، بەشێوەیەك هەندێ لەسەرچاوەکان باس لەوەدەکەن کـەئاینی ئیسـلام بـەروونی بڕیـاری لـەمافی ئـــازادی وەك پرەنســـیپێکی گشـــتی داوە، بـــەڵام هەڵەیـــەکی مەنهەجی دەکەین، بەوەی داوا لەدەقە ئیسـلامییەکان بکـەین یان هەر دەقێکی تر بکەین کەدەربارەی ئازادی بەزمانی ئەمرۆ بۆمان بدوێ.[3] هەروەها(شێخ نەدیم ئەلجسر)لـەکتێبی(فلسـفة الحرية فی الاسلام)دا دەڵێ:" خـەڵکی بـەئازادی لـەدایکبوونو ئازادیشیان لەهەموو شتێکدا رەهایەو بەرەهاییش دەمێنێتەوە تاوەکو بەر چاکە یان راستی دەکەوێت".[4] لەسەرچاوەیەکیتری ئیسلامیدا هاتووە کـە"ئـازادی مـرۆڤ لەئیسـلامدا رەهایـە،

تائەوکاتەی بەر راستیو چاك دەکەوێت، بەسنوری ئەو چاکەو راستییەش سنوردار دەکرێت". [5]

هەندێکیتر وادەبینن کەئازادی لەئیسلامدا رێژەیی بێت، چونکە رەهایی ئازادی تاکەکەس بۆنموونە زیان بەئەوانیتر دەگەیەنێو زیان بەبەرژەوەندی کۆمەڵگەش دەگەیەنێ. بۆیە ئیسلام ئازادی سنوردار دەکات، لەبەر بەرژەوەندی کۆمەڵگە. [6] هەروەها ئەوەش هاتووە کەئازادیی لەئیسلامدا نابێت رەهابێت بەبێ کۆتو بەند، ئیسلام رێسایەکی گشتی بۆهەموو ئازادییە زیهنییەکان داناوە، بۆئەوەی مرۆڤ رقی لەوانیتر نەبێتەوە، لەبەرئەوەی باوەڕیان بەبیروبۆچوونو باوەڕێکیتر هەیە. [7]

لەلایەکیترەوە(د.فەوزی بەدەوی) بیروڕای وایە کەمەسەلەی ئازادی لەبواری ئاینیدا کارێکی نوێیە، ئیتر ئازادی بیرکردنەوە بێت یان ئازادی رادەربڕین. [8] هاوکات تێبینی ئەوەش دەکرێ کەشارەزایانی بواری ئاینیو ئیسلامی باسیان لەوە کردووە کەئاینی ئیسلام هێندە ئازادی بەتاکەکەس بەخشیوە، بۆئەوەی گوزارشت لەبیروڕاو بیروباوەڕی بکات. هەروەها ئەوەندەش ئاگاهی پێداوە کەئازادی بۆگاڵتەکردن بەوانیتر بەکارنەهێنێ. [9]

لەبارەی ئازادی رادەربڕینیشەوە لەدیدگاو جیهانبینی ئیسلامییەوە، ئەوا قسەی زۆر لەوبارەوە کراوە، بەجۆرێ هەمووان هاودەنگن لەوەدا کەئاینی ئیسلامو شەریعەتی ئیسلامی ئازادی رادەربڕینو بیروڕای وەك ماف بۆهەموو مرۆڤێك داناوە، هەموو ئەوانەی کەپەیوەندییان بەئەخلاقو بەرژەوەندییە گشتییەکانو سیستمی گشتییەوە هەیە. [10]

هەروەك بـاس لـەوەش کـراوە کـەئازادی رادەربـڕین بـەدایکی ئازادییەکانی تر لەشەریعەتی ئیسـلامیدا دادەنـرێ، کەلەسـەر بنـەما شـەرعییەکان دادەمـەزرێ و تیایـدا (فـەرمان بەچـاکەو رێگری لەخراپـە دەکـرێ). بەشـێوەیەك بـەگوێرەی دیسـپلینە شـەرعییەکان مومارەسـە دەکـرێ، تـاوەکو مەبەسـتەکانی شەریعەت وەدی دەهێنێ. هەر لەشوێنێکیتردا هاتووە کەئازادی رادەربڕین لەئازادییـە رەسـەنەکانە لەئیسـلامدا، بـەلام کـەی لەتاوانی ناوزڕاندن و قەزف نزیکبووەوە، ئەوا هێڵـە سـورەکانی تێپەڕاندووەو پێویستە لەسەر ئەنجامـدەرانی ئـەو تاوانـە سـزا بدرێ بەگوێرەی ئەو دەقانەی کەلەشەرعدا هاتووە. [11]

لەسەرچاوەیەکی تـری ئیسـلامیدا دیسـان ئـەوە هـاتووە کـە: ئیسلام دژی هونەرو دژی گوزارشتی مرۆیی نیـە، بـەڵکو دژی لادانی رەوشتی(الاباحیة)و لادانـی بیروباوەڕییـە. [12] هاوکـات زۆر دەقی ئایەت و فەرمودە دەبینرێ بۆ وتنی راستی و ئـازادی رادەربـــــڕین و بـــــیروڕا، وەك ئـــــەو فەرمودەیـــــەی کەپێغەمبەر(د.خ)فەرمویەتی:" ئەو کەسەی لەئاسـتی راسـتی بێـدەنگ دەبـێ بریتیـە لەشـەیتانێکی کـەڕ"، یـاخود لەفەرمودەیەکی تردا هاتووە:" لایحقـرن احـدکم نفسـه، قـالوا : یارسول الله وکیف یحقر اخا نفسه؟قال: یري ان علیه حقا لایقول فیه، فیقول الله عز وجل یوم القیامة: مامنعك ان تقول فی کذا وکـذا؟ فیقـول:خشـیة النـاس، فیقـول:فایـای کنـت احـق ان تخشي".رواه ابن ماجه. [13] تەنانەت مرۆڤ ئازادە لەهەڵبژاردنی بیروباوەڕدا و ئەم چەند ئایەتە بڕیاری ئازادی مـرۆڤ لـەبیروباوەڕ

دەدەن، بەوەی مرۆڤ ئازادە باوەڕ بەئیسلام بهێنێ یان نا، کاتی خۆیش پەیامبەر(د.خ) بۆی نەبووە زۆر لەکەسێك بکات ئیسلام ببێ و باوەڕ بهێنیێ.(14) ئەمەش دەقی ئایەتەکانە:

- ﴿وقل الحق من ربكم فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر﴾(الكهف/29).
- ﴿ولو شاء ربك لامن من فى الارض كلهم جميعا، افانت تكره الناس حتى يكونوا مؤمنين﴾(يونس/99).
- ﴿انا خلقنا الانسان من نطفة امشاج نبتليه فجعلناه سميعا بصيرا، انا هديناه السبيل اما شاكرا واما كفورا﴾(الانسان/2-3).

جیا لەمانەی کەباسکرا، سەرچاوە ئیسلامییەکان لەچوارچێوەی ئازادی و ئازادی ڕادەربڕیندا قسە لەسەر ئەوەش دەکەن کەئازادی ڕادەربڕین و ئازادی قسەکردن بۆناموسوڵمانیش دەرفەتی پێدراوە، بەتایبەت لەبواری ڕەخنەگرتندا، بەشێوەیەك(ئەبو عەلای مەودودی)لەمبارەوە دەنوسێت:" ناموسوڵمان لەدەوڵەتی ئیسلامیدا مافی ئازادیان هەیە لەوتارو نوسین و بیرکردنەوەو کۆبوونەوەدا، واتە ئەو مافانەی کەموسوڵمان هەیەتی، هەروەك ئەو کۆت و پێوەندو ئیلتیزاماتانەش لەسەریان هەیە کەلەسەر موسوڵمان هەیە. هاوکات ڕێگەیان پێدراوە کەرەخنە لەحکومەت و فەرمانبەرەکانی و تەنانەت سەرۆکی دەوڵەتیش بگرن

لەسنوری یاسادا. هەروەها مافی رەخنەگرتنیشیان لەمەزهەب هەیە". (15)

هەر لەمڕووەوە(ئیسماعیل فاروقی)یش دەڵێت:" ناموسوڵمان مافی گوزارشتکردنی لەبیروڕاکانی هەیە لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامیدا، بەڵام بەمەرجێ سنوری گشتی موسوڵمانان نەبەزێنێ و پێشێلی نەکات". (16)

بەهەرحاڵ ئەوانەی باسکران بریتی بوون لەروانینی ئاینی و جیهانبینی ئیسلامییانە بۆچەمکی ئازادی و ئازادی ڕادەربڕین، بەڵام رەنگە کێشەی سەرەکی ئەوە بێت کەلەژیانی کرداری و لەواقیعی جێبەجێکردندا ئەو دەق و تەعالیمە ئیسلامییانە وەك خۆی پەیڕەو نەکرابێ و بەپێچەوانەوە بەشێکی زۆر لەفەرمانڕەوایانی ئیسلامی ئەوانەی کەبەناوی خەلافەت و دەوڵەتی ئیسلامییەوە فەرمانڕەوایەتیان کردووە لەهەندێ قۆناغ و سەردەمی مێژوییدا پێچەوانەی تەعالیمەکانی ئاینی ئیسلام هەڵسوکەوتیان کردووە. لەراستیدا رەنگە ئێمە تەنها بتوانین پشت بەرووداوەکانی سەردەمی حوکمی پەیامبەری ئیسلام(د.خ) و سەردەمی راشیدین ببەستین بۆپەیڕەوکردنی ئەو پرەنسیپ و تەعالیمە ئیسلامییانە، ئەگەرنا بۆنموونە لەسەردەمی ئومەوییەکاندا ژمارەیەکی زۆر لەخەلیفەکانی بنەماڵەی ئومەیە لەبنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بەتایبەت لەبواری فەرمانڕەوایەتی و

یەکسانیو دادپەوەریو پێدانی مافی ئازادیو ئازادی ڕادەربڕیندا لایانداو بەپێچەوانەوە ڕەفتاریان کردووەو زۆربەی سەرچاوە ئیسلامییەکانیش بەراشکاوی ئەم لادانەی ئومەوییەکانیان تۆمارکردووەو باسکردووە. بەتایبەت ڕەفتاری ئومەوییەکان لەبەرامبەر مسوڵمانە ناعەرەبەکاندا کەبە(موالی)ناویان بردوون بەئاشکرا دەبینرێن، بەجۆرێ پارچە پەڕۆیەکی سوریان دەکردە قەدیانەوە بۆئەوەی بناسرێنەوە کەئەمانە لەرەچەڵەکدا عەرەب نین. هەروەها لەکاتی نانخواردندا لەپەراوێزی سفرەو خوانەکەوە دایان دەنانو لەرووی سیاسییشەوە هیچ پلەو پۆستێکیان پێنەدەبەخشینو لەسوپاشدا بۆیان نەبووە سواری وڵاخو ئەسپەکان بنو لەرووی ئابوریشەوە باجی زۆرو جۆراو جۆریان بەسەردا دەسەپاندن. ئەمە جگەلەوەی لەرووی کۆمەڵایەتییەوە زۆر بەسوکی تەماشایان دەکردنو ئەو منداڵانەی کەلەژنێکی موالی زاتە لەژنێکی موسوڵمانی ناعەرەبو پیاوێکی عەرەب لەدایکدەبوو پێیان دەوترا(هجین) واتە (دوورەگ)، ئەمەش ناونانێکی سوك بوو. سەرەڕای ئەوەی کەدەیانوت:" نوێژ ناپچڕێت تەنا بۆسێ شت نەبێت: سەگ، گوێدرێژ، موالی، واتە مسوڵمانی ناعەرەب". [17]

لەسەردەمی ئێستاشدا بەهۆی زۆربوونی قوتابخانەی ئاینیو زۆربوونی گروپو هێزی ئاینیو ئیسلامییەوە،

بەتایبـــەت باڵادەســـتبوون‌و هـــەژموونی بیرکردنـــەوەی سـەلەفیەتی جیهـادی، ئـەو دەق‌و تەعالیمانـەی ئـاینی ئیسلام لەرووی ئازادی‌و ئازادی ڕادەربڕینەوە حسـابێکی ئـەوتۆیان بۆنـاکرێ لـەبواری جێبەجێکردنـدا، بـەڵکو لۆژیکی یەکلاییکردنەوەو پێناسەکردنی ئازادی‌و ئـازادی ڕادەربـــڕین، تەنانـــەت مەســـەلەکانی مســـوڵمانبوون‌و بێبـاوەڕبوونی مرۆڤـەکان بریتییـە لـەلۆژیك‌و پێـوەرو لێکدانەوەی ئەو سەرکردەو میرو لێپرسراوە شـەرعیانەی بەشێکی زۆر لەو گروپانە بەگشتی. ئەمـەش وایکـردووە کەتەعالیمـەکانی ئـاینی ئیسـلام زیـاتر لـەناو سـیاقی ئایەتەکان‌و دەقەکانـدا بەزینـدوویی بمێننـەوەو لەسـەر زەوی واقیع کاریان پێنـەکرێت، بـەڵکو زیـاتر تەفسـیرو لێکدانەوەی ئەم گروپانە ڕۆڵی یەکلاییکەرەوە ببینێت.

لەم نێوەندەدا هەر لەڕوانگەی ئاینی ئیسـلامەوە کاتێـك هەم پێناسەی ئازادی‌و هەم پێناسەی ئـازادی ڕادەربـڕین دەکرێ، باسمان لەوە کرد کەجۆرێك لەمەرج‌و سـنوردانان هەیە. بۆیە لێرەوە ئاماژە بەهەندێ لەو مـەرج‌و سـنورو هێڵە سورانە دەکەین، کەلەڕوانینی ئاینی‌و ئیسلامییەوە بەمایەی زیان گەیاندن دەشکێتەوەو پێویسـتە ئـازادی‌و ئازادی ڕادەربڕین سنوردار بکرێـت، ئەمـەی خـوارەوەش پوختەی ئەو مەرج‌و سنورانەیە:

1. دانانی تیۆری هاوسەنگی لەمومارەسەکردنی ئازادیدا لەنێوان بەرژەوەندیو خراپەدا بۆئەوەی مرۆڤ نەکەوێتە زیانی ئەوانیترەوە.
2. نابێت ئازادی بۆئامانجو مەبەستێك بەکاربێت کەپێچەوانەی شەریعەتی ئیسلام بێت، چونکە شەریعەت هەمووی بەرژەوەندییە.
3. ڕەچاوکردنی پرەنسیپی(لا ضرر ولا ضرار)لەکاتی مومارەسەرکردنی ئازادی ڕادەربڕیندا، واتە وەك پەندێکی پێشینانی کوردی دەڵێ:" نەشیش بسوتێو نەکەباب-تویژەر-".
4. پێویستە ئازادی بەدیهێنەری مەبەستەکانی شەریعەتی ئیسلامی بێت.[18]
5. پێویستە هەر کەسێك کەئاماژە بۆ ڕاستی بدات بەبیروبۆچوونو بیروڕا، ئەو شتە دەبێ بەرژەوەندی بێت. واتە ئازادی لەچوارچێوەی چاکەو بەرژەوەندیدا گوزارشتی لێدەکرێت.
6. لەسەر موسوڵمان پێویستە ئەگەر هاتوو بیروڕای دەربڕی، دەبێ ئەو بیروڕا دەربڕینە وەڵامدانەوەی فەرمانەکانی خودا بێو کارکردن بێت بەفەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپە.
7. پێویستە ئازادی ڕادەربڕین وتنی وشەیەکی بوێرانە بێت لەڕووی ستەمکارێکدا.

8. پێویستە پارێزگاری لەپێنج پێویستییەکە بکرێ، کە لەهەمانکاتدا بریتیشن لەمەبەستەکانی شەریعەت(ئاین، نەفس، وەچە، دارایی، عەقڵ).
9. رەچاوکردنی بەرژەوەندی موسوڵمانانو دوورخستنەوەی خراپە لێیان.[19]
10. رێگرتن لەگاڵتە پێکردنی پیرۆزییەکانی کۆمەڵگە.
11. حەرامکردنو قەدەغە کردنو رێگەنەدان بەگاڵتە پێکردنی شەرەفو ناموس.
12. حەرامکردنو رێگەنەدان بەدرۆو ئازاردانی زمان.
13. هاوسەنگی کردن لەنێوان بەرژەوەندیو خراپەو خەملاندنی چاکەو خراپە بەبڕیاردانی شەرع.
14. زیادەڕەوی نەکردنو یاخینەبوونی مرۆڤ لەدەربڕینی بیروڕاو سەرکردایەتیو فەرماندەیەتیو فەتوادانو توانایيو...تاد دا.[20]

باسی دووەم(دیدگای یاساییو دەستوری بۆئازادیو ئازادی رادەربڕین)

وەك لەباسی یەکەمی بەشی دووەمدا دیدگاو روانینو جیهانبینی ئاینیو ئیسلامیمان دەربارەی ئازادیو ئازادی رادەربڕینو ئازادی قسەکردن خستەڕوو، گرنگە لەم باسەی تریشدا روانینی یاساییو دەستوریو گۆڕانکارییو پەرەسەندنە مێژووییەکان لەو بارەوە بخەینەڕوو لەگەڵ رێڕەوی قالب گرتنی یاسایی مافی ئازادیو ئازادی رادەربڕیندا، بزانین هەم لەمێژوویی مرۆڤایەتیو هەروەها بەهۆی جاڕنامەو کۆنگرەو کۆنفرانسە نێوخۆییو ناوچەییو جیهانییەکانەوە چۆن هاتووە. چونکە ئاستو شێوازو جۆری ئەو ئازادیانەی کەئەمڕۆ لەولاتانی رۆژئاوادا بەدی دەکرێو پیادە دەکرێو مومارەسە دەکرێ لەنێو مێژوویەکی پڕ لەبەریەککەوتنو پێکدادانو هەڕەشەو مەترسیو تەنانەت لەنێو مێژوویی خوێنو حەلالکردنی کوشتنو سڕینەوەی رۆشنبیرانو نوسەرانو فەیلەسوفانو بیریارانەوە سەرچاوەی گرتووە. هەروەها لەرۆژهەلاتیشدا هەر وابووەو هاتنو قەدەغەکردنی بلاوبوونەوەی پەیامە ئاینیەکان بەلگەیەکی ئاشکراو روونی ئەم بابەتەن. واتە رێگەی گەشەکردنو سەرهەلدانو درێژبوونەوەی ئازادی بەگشتیو ئازادی رادەربڕین بەخوێن دەستی پێکردووە. بۆیە گرنگە ئاوڕێك لەڕووەوە یاساییو دەستوریو مێژووکردەکەی بدەینەوە. هەرچەندە هەم رێنیسانسی ئەوروپاو دواتریش شەپۆلی رۆشنگەریو لەهەمووی گرنگتر شۆڕشی فەرەنسی لەساڵی(1789) کار ئاسانی گەورەیان کرد لەرزگارکردنی مرۆڤەکانو رۆشنبیرانو نوسەرانو فەیلەسوفان

لەکۆتو پێوەندەکانی کەنیسەو ئاینی مەسیحییەتی سەدەکانی ناوەڕاستو پەرەیان بەچەمکی ئازادیو ئـازادی رادەربـڕین دا، بەڵام لەرووی یاساییو دەستورییەوە درەنگتر تاڕادەیەك قاڵـبو چوارچـێوەی خـۆی گـرت، بـەجۆرێك یاسـا دانراوەکـان تـەنها لەکۆتاییەکانی سەدەی هەژدەو سـەرەتاکانی سـەدەی نـۆزدەدا نەبیٚ، یان پێش ئەوە تیۆری ئازادییان نەناسیوەو دانیشیان پێدا نەناوە. هاوکات تونـدترین سـزاش لـەو یاسـایانەدا بۆبیریـارو بانگەشـەکارانی ریفـۆرمو گۆڕانکـاریو پیشـەنگانی ئـازادیو ئازادی رادەربڕین تەرخانکراوە.[21]

بەڵام دەبیٚ لـەم نێوەنـدەدا رۆڵـی مـەزنی شۆڕشـی فەرەنسـی لەساڵی(1789) لەبیر نەکەین، کەچ نەخشێکی مـەزنی گێـڕا لـــەجێگیرکردنو گێڕانـــەوەی مافـــەکانی مـــرۆڤ بەگشـــتیو لەنێویشـــیاندا مـــافی ئـــازادیو ئـــازادی رادەربـــڕینو ئـــازادی قسەکردن. رەنگە هەڵە نەبین گـەر بڵـێین لەبنەڕەتـدا شۆڕشـی فەرەنسی لەساڵی(1789)شۆڕشی بەدەست هێنـانی ئـازادیو ئازادی رادەربڕین بووەو خـەباتو قوربانیـدان بـووە لـەپێناوی ئازادیـدا. بۆیـە کاتێـك شـۆڕش سـەرکەوت لەهـەمان سـاڵو لەرۆژی(1879/8/26)جاڕنامەی مافەکانی مرۆڤو هـاوڵاتی راگەیەنرا لەفەرەنساو ماددەی(11)ی ئەو جاڕنامەیە تایبەتـە بەئازادیو ئازادی رادەربـڕین بەمشـێوەیە دەڵێـت:" ئـازادیو گوزارشـتکردن لـەبیروڕاو بـیرو بۆچـوون، بریتییـە لەئازادییـە بنەڕەتییەکانی مرۆڤو بڕیار دەدرێـت کەهـەموو لایـەك مـافی هەیە لەگوزارشتکردنو دەربڕینو نوسینو بڵاوکردنەوە بەهەموو

ئازادییەك، تەنها لەدۆخی زیادەڕەویکردن نەبێ لەو ئازادییەدا، کەبەگوێرەی یاساکە دیاریکردووە."(22) لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاش، کەهەر لەسەرەتای دامەزراندنیەوە تارادەیەك وەك دەوڵەتێکی دیموکراسی خۆی بیناکرد، لەدەستورەکەیدا کەلەرۆژی(1891/12/15) موسادەقەی لەسەر کرا بەمجۆرە دەربارەی مافو ئازادییەکان دەدوێت:" کۆنگرێس توانای دارشتنی یاسا گەلێکی نیە کەسروتە ئاینیەکان یان قەدەغەکردنی مومارەسەکردنیان بەئازادی بسەپێنێ، هەروەك کۆنگرێس سەرپشك نییە بەگوێرەی ماددەی(1)ی دەستور کەیاساگەلێك دەربکات، کەئازادی رادەربڕین یان رۆژنامەگەری سنوردار بکات، یاخود دەست لەئازادی هاوڵاتییان لەکۆبوونەوەیان بۆئاراستەکردنی سکاڵاکان بۆحکومەت بۆرەخنەگرتن لەبارودۆخو چاککردنیان وەربدات".(23)

بۆیە دواتر تاوەکو سەردەمی ئێستا چەندین گۆڕانکاریو پێشکەوتن لەبواری ئازادیو ئازادی رادەربڕین لەوڵاتانی جیهاندا هاتوونەتە ئاراو چەندین رێکەوتننامەو کۆنگرەو کۆنفرانسی جیهانیو ناوچەیی گەورەی بۆبەستراوە. بەشێوەیەك نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاریدا لەبەڵێننامەی نێودەوڵەتی تایبەت بەمافە مەدەنیو سیاسییەکان لەساڵی(1966)بەگوێرەی بڕیاری(2200)و(1200). ژمارەی ئەو دەوڵەتانەی کەئیمزایان لەسەر ئەم بەڵێننامەیە کردلەو ساڵەدا(127)دەوڵەت بوون. ماددەی(19)لەبڕگەی

یەکەمیـــدا دەڵێـــت:" هـــیچ مرۆڤێـــك نابێـــت بـــەهۆی بیروبۆچـوونەکانییەوە رووبـەڕووی فشـار ببێتـەوە". لەبڕگـەی دووەمیشدا هاتووە:"هەموو مرۆڤێك مافی ئازادی رادەربڕینی هەیە، ئەم مافـەش ئـازادی گـەڕانو زانسـتو بڵاوکردنـەوەی زانیاریو بیروبۆچوونی دەگرێتەوە، ئیتر هەر جۆرێك بێت، بەبێ رەچاوکردنی سنور لەرێگەی ئاڵوگۆڕی زارەکـی یـان بەرێگـەی نوسینو بڵاوکردنەوە یان بەشـێوە هونەرییـەکان، یـاخود جگـە لەوانەش لەو ئامرازانەی کەهەڵیدەبژێرێ". (24)

هەروەها رێکەوتننامەی پاراستنی مافەکانی مـرۆڤو ئازادییـە بنەڕەتییەکانی(رێکەوتننامەی ئەوروپی بۆپاراستنی مافـەکانی مرۆڤ) لەماددەی(9)دا ئـازادیو ئـازادی رادەربـڕینو بـیروڕاو ئـاینو بیروبـاوەڕ لـەخۆدەگرێت. ئـەم رێکەوتنامەیـە بـەوە جیادەکرێتـەوە کەهـەر دەوڵـەتێکی ئـەوروپی کـار لەسـەر هەڵوەشاندنەوەی بکات، ئەوا ئەندامێتی لەئەنجومەنی یـەکێتی ئەوروپا لەدەستدەدات.(25) هەروەها رێکەوتننامەی ئـەمریکی بۆمافـەکانی مـرۆڤ کەلەشـاری(سـان خوسـیە)ی پایتـەختی کۆستاریکا لەرۆژی(1969/12/3)بەسترا، دەربارەی زۆرێـك لەئازادییەکانو لەوانەش ئازادی رادەربڕینو ئـازادی قسـەکردن دەقـی لەسـەر هـاتووە. ئـەم رێکەوتننامەیـەش بـەوە لـە رێکەوتننامەکەی یەکێتی ئەوروپا جیادەکرێتەوە،کەژمارەیـەك لەمافـەکانی باسـکردووە کەلەرێکەوتننامـە ئەوروپییەکـەدا باسنەکراوە لەوانە:

1. ملکــەچ نــەبوونی ئــازادی ڕادەربــڕینو بــیروڕا بۆسانسۆری پێشوەخت.
2. مافی ڕاستکردنەوەو وەڵامدانەوە.(26)

هەر لەمبارەوە بەڵێننامەی ئەفریقی بۆمافەکانی مرۆڤو گەلان، کەلەساڵی(1981)دا دەرچووە ماددەی(9)لـەو بەڵێننامەیە پێدا دەگرێ لەسەر ئەوەی:

1. هەموو تاکەکەسێ مافی بەدەست هێنانی زانیاری هەیە.
2. هـــەموو مرۆڤێـــك مـــافی گوزارشـــتکردنی لـــەبیروڕاکانیو بلاوکردنـــەوەیان لەچوارچـــێوەی یاساکانو لائیحەکاندا هەیە.(27)

ئەنـــدامانی ڕێکخـــراوی کـــۆنگرەی ئیســـلامیش لەســـاڵی(1990) جاڕنامـــەی قاهیرەیـــان دەربـــارەی مافەکانی مرۆڤ لەئیسلامدا ڕاگەیاند، ماددەی(21)لەو جاڕنامەیە پێدا دەگرێ لەسەر مافی ئازادی بیرکردنەوەو ئـــازادی بیروبـــاوەڕو ڕادەربـــڕین. بڕگەکانیشـــی ئەوانـــە دەگرێتەوە کەبەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤ لەئیســلامدا بڕیاری لێداون.(28) کە لەمانەی لای خـوارەوەدا خۆیـان دەبیننەوە:

1. هەموو مرۆڤێـك بـۆی هەیـە بـیر بکاتـەوەو گوزارشت لەبیروڕاو بیربـاوەڕی بکـات، بـەبێ دەستێوەردانو دەست بەســەرا گــرتن، مــادەم پابەندە بەســنورە گشــتییەوە، کەشــەریعەتی

ئیسلامی بڕیاری لەسەرداوە. هەروەها نابێ خراپە بلاوە پێبکات یان ئەو شتە بلاوبکاتەوە کەتیایدا ڕەواجدان بەخراپەو سەرشۆڕکردنی ئوممەتی ئیسلامی هەبێت.

2. بیرکردنەوەی ئازاد -گەڕان بەدوای ڕاستیدا- تەنها ماف نییە، بەڵکو بریتییە لەئەرکیش.
3. مافی هەموو کەسێکەو ئەرکیشییەتی کەستەم ڕەت بکاتەوەو نکوڵی لێبکات.
4. ڕێگری لە بلاوکردنەوەی زانیارییەکانو ڕاستییە دروستەکان نییە، مەگەر تەنها لەبلاوکردنەوەیدا مەترسی بۆسەر ئاسایشی کۆمەڵگەو دەوڵەت هەبێت.
5. ڕێزگرتنی سنوری ئەو کەسانەی کەسەرپێچی لەئاینی ئیسلام دەکەن(واتە ئەو کەسانەی کە ناموسوڵمانن-توێژەر-) لەڕەوشتی مرۆڤی مسوڵمانەو هیچ کەسێ ناتوانێ گاڵتە بەبیروباوەڕی جگە لەخۆی بکات.(29)

جگەلەوەی لەزۆربەی بەندەکانی تریدا باس لەمافو ئازادییە گشتییەکانی تریش کراوەو وەك بەڵێننامەیەکی نێودەوڵەتی دانی پێدانراوە. بەڵام گرفتەکە ئەوەیە کەدیسان ئەم مافو ئازادییانەی کەباسکران کەمتر لەواقیعدا جێبەجێ دەکرێن. بۆیە تێبینی دەکەین کەبەریەککەوتنو پێکدادانی

نێوان هێزو کەس و گروپە کۆمەڵایەتییەکانی لێدەکەوێتەوەو بەردەوامە.

دواجار ئەوەی دەمێنێتەوە لەکۆتایی ئەم باسەدا کەبیڵێین، ئەویش ئەوەیە کە جاڕی گەردوونی مافەکانی مرۆڤ کە لەلایەن ئەنجومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە لەرۆژی(10ی کانوونی یەکەمی 1948) پەسەندکراوەو راگەیەنراوەو بریتییە لە(30)بەند، تیایدا زۆر ماف و ئازادی بۆمرۆڤ دەستەبەرکردووە، هەرچەندە ئەم رێکەوتننامەیەش لەژیانی رۆژانەی مرۆڤدا کەمتر جێبەجێ دەکرێت، بەڵام تائێستا سەرەکیترین بەڵگەنامەیە کەزۆربەی وڵاتانی جیهان پێیەوە پەیوەست و پابەندبن، بەجۆرێك ئەگەر جێبەجێشی نەکەن، ئەوا لەرووی تیۆرییەوە وەك بەڵگەنامەیەکی جیهانی باوەڕیان پێیەتی و مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن. لەبەندی(3)ی بەڵگەنامەی مافەکانی مرۆڤی نەتەوە یەکگرتووەکاندا هاتووە:" هەموو کەسێك مافی ژیان و ئازادی و ئاسایشی خۆی هەیە".[30] هەروەها ماددەی(19)یش دەڵێت:" هەموو کەسێك مافی ئازادی بیرو رادەربڕینی هەیەو ئەم مافەش بەبێ خۆ تێکەڵکردنی کەسێکی دیکەو وەرگرتنی هەواڵ و بیروباوەڕو بڵاوکردنەوەیان بەهەر شێوەیەك و بێ خۆبەستنەوە بەسنوری جوگرافی دەگرێتەوە".[31]

باسی سێیەم(چەند نموونەیەك لەئازادیو ئازادی رادەربڕین لەدەستورە جیاوازەکاندا)

بەپێویستنی دەزانین پێگەی ئازادی رادەربـڕین لەهەنـدێ دەستوری وڵاتانی جیهانیـدا بـزانین، پاشـان ئاماژەیـەك بۆئازادیو ئازادی رادەربڕین لەپرۆژە یاسای رۆژنامەگەری کوردســتاندا بکــەین کەبەمدواییانــە پــاش چــەند گۆڕانکـاریو دەسـتکاریکردنێك لەلایـەن سـەرۆکایەتی هــەرێمی کوردسـتانەوە پەسـەندکرا، بـەحوکمی ئـەوەی رۆژنامەگەری پانتاییەکی گـەورەو فراوانـی دەرکـەوتنو بەرجەسـتەکردنی نوسـینی ئـازادو قسـەکردنی ئـازادە. هەروەها ئاماژە بەدەستوری هەرێمی کوردستاندا بکەین، هەرچەندە تاوەکو ئێستاو تانوسینی ئـەم لێکۆڵینەوەیـە رەشنووسەو موسادەقەی لەسەر نەکراوەو ماوەتەوە.

ئازادیو ئازادی رادەربڕین لەدەستوری وڵاتانی ئەوروپادا

فەرەنسا:

هەندێ ماددەو برگەی یاسـایی لەدەسـتوری فەرەنسـیدا هــەموو نوســینو لێــدوانێکی ئاشــکراو بلاوکردنــەوەی بیروبۆچوونێك قەدەغە دەکات، کەببێتە هۆی رقلێبوونەوە یــاخود زۆر لێکــردن بــەهۆی هۆکــارە ئــەتنی یــان ئاینییەکانــەوە. هــەروەها بەدرۆخســتنەوەی تــاوانی کۆمەڵکوژی جولەکە(هۆلۆکۆست) کەنازییەکان لەجەنگی

دووەمی جیهانیدا ئەنجامیان دا، لەدەستوری فەرەنسیدا بەتاوان دادەنرێ و سزای یاسایی لەسەرەو لەسەر ئەمەش هەریەکە لەبیریاری مسولّمانی فەرەنسی(رۆجیە گارودی)و رۆژنامەنووس(ئیبراهیم نافیع) بەتۆمەتی دژایەتیکردنی سامییەت و نکوڵیکردن و بەدرۆخستنەوەی کارەساتی هۆلۆکۆستی جولەکە تۆمەتبارکران و سزای یاسایی دران.[32]

ئەڵمانیا:

لەیاسای بنەڕەتی ئەڵمانی و ئەوەی کەناونراوە( grund gesets)، بەندی پێنجەم کەدەربارەی ئازادی رادەربڕینە تیایدا باس لەوە دەکات کەهەموو نوسین و وتارێکی رقلێبوونەوە کەدژی رەگەزو ئاین و ئارەزووی سێکسی بێت، هەروەها بەکارهێنانی سیمبوڵە نازییەکانیش وەك خاچی چەماوە قەدەغە دەکات.

پۆڵەندا:

تائەمڕۆش سوکایەتیکردن و گاڵتەکردن بەرامبەر بەکەنیسەی کاسۆلیکی مەسیحییەت و سەرۆکی دەوڵەت بەتاوان دادەنرێت و سزای یاسایی لەسەرە. لەم نێوەندەدا دادگای پۆڵەندی رۆژی(2005/1/5)سزای رۆژنامەنووس(جیرزی ئوربان)ی بەبڕی(5000)هەزار یۆرۆ غەرامە کرد، بەهۆی سوکایەتیکردن و گاڵتەکردن

بەکەسایەتی پاپـای کۆچـکردوو(پاپـا یوحـەننا پۆڵسـی دووەم).

کەنەدا:

یاسای کەنەدی هەموو وتارو بیروڕایـەکی رقلێبوونـەوە دژی هەر کۆمەڵەو گروپێکی ئـەتنی قەدەغـە دەکـات. هەروەها ئەو بیربۆچوون‌و قسەو وێنانەش قەدەغە دەکات کەلـــەڕووی ئـــەخلاقی‌و سێکســـییەوە بەگاڵتـــەو ســـوکایەتیکردن دادەنرێـــت. پەرلـــەمانی کەنـــەداش ڕۆژی(2004/4/29)ڕەزامەنـــدی لەســـەر یاســـایەك دەربــڕی کــەرێگری دەکــات لەگاڵتــەکردن‌و ســوکایەتی پێکردنـــی کەســـێك بـــەهۆی ئـــارەزوو خواســـتە سێکسییەکانەوە.[33]

ئازادی رادەربڕین لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

لەویلایەتــە یــەکگرتووەکانی ئــەمریکا تاڕادەیــەکی زۆر جیاوازتر لەڕووی سیاسی‌و دەستورییەوە باسی لەئازادی‌و ئازادی رادەربڕین‌و قسەکردن کردووە، بەجۆرێك دادگـای بــالاّ پێــوەرێکی دانــاوە بۆئــەوەی کـام شـتە دەبێتــە سوکایەتی‌و گاڵتەپێکردن یاخود بەزاندنی سنوری ئازادی

رادەربــڕین، ئەمــەش پێــی دەوترێــت تاقیکردنــەوەی میلــر(miller test)، لەســاڵی(1973)ەوە کــاری پێدەکرێت. پێوەرەکەش پشتی بەسێ پرەنسیپی ســەرەکی بەستووە کەئەمانەن:

ئەلف: ئەگەر هاتوو زۆرینــەی کەســەکان لەکۆمەڵگــەدا وایان دانا کە رێگەو شێوازی رادەربڕینەکە قبوڵکراوە.

بــا: ئەگــەر هــاتوو رێگــەو شــێوازی پێشکەشــکردنی بیروراکـــان پێچـــەوانەی یاســـاکانی تـــاوان بـــوو لەویلایەتەکەدا(واتە ئەو ویلایەتــەی کەبیروراکــەی تێــدا دەربراوە-توێژەر-).

جیم: ئەگەر هاتوو رێگــەی خســتنەروو یــان بەرجەســتە کردنی بیروراکە بەشێوەیەکی هونەری یان ئەدەبی بوو.

هاوکــات لەئــەمریکا ئــەوەی جێگــەی باســە ئەوەیــە کەنکوڵیکردن لەرووداوو کارەساتی هۆلۆکۆستی جولەکە بەتاوان دانانرێ‌و وەك فەرەنساش سزای یاساییشی لەسەر نییە، بۆیە تێبینی دەکــرێ کەزۆربــەی کۆمەڵــە نازییــە نوێیەکان ناوەندێی ئیعلامییان لەو وڵاتەدا داناوە.(34)

ئازادی رادەربڕین لەوڵاتانی ئەفریقیا

زۆربەی دەوڵەتە ئەفریقییەکان لەدەستورەکانیاندا دەقیان تەرخانکردووە سەبارەت بــەئازادی‌و ئــازادی رادەربــڕین، بەڵام بەگوێرەی روانــین‌و لێکدانــەوەی چــاودێرانی مــافی

مرۆڤ ئازادی ڕادەربڕینو خودی ئازادی خۆی لەسەر زەوی واقیع جێبەجێ نەکراوەو بگرە یاسا شکێنی زۆریش کراوە لەبەردەم گوزارشتکردنی هاوڵاتیان لەبیروڕاکانیان. بەشێوەیەك هەریەکە لەوڵاتانی کینیاو گاناو ئەریتریا لەپێشترینی ئەو وڵاتانەن کەئازادی ڕادەربڕین لەقەیراندایەو بەپلەی یەکەم دێن لەدەستبەسەرکردنی ڕۆژنامەنووسانو نوسەراندا.

هەروەها لەوڵاتانی سوٚدانو لیبیاو گینیا سانسۆری حکومی لەسەر ئامرازەکانی ڕاگەیاندن هەیەو سەرەتاکانی باشبوونی ئازادی ڕادەربڕینیش لەوڵاتانی چادو گابۆنو کامیرۆن بەدی دەکرێت.(35) هەرچی وڵاتی میسرە لەم کیشوەرەدا ئەگەرچی سیستەمەکە خۆی وەك سیستمێکی عەلمانیو دیموکراسی دەناسێنێ، بەڵام جگەلەوەی کەتەواو پێچەوانەی ئەمەیە، هاوکات مێژوویی‌ەکی تایبەتیشی هەیە لەسانسۆر خستنەسەر نوسینو ئازادی ڕادەربڕینو قسەکردنی ئازاد دا، بەجۆرێك ئازادی ڕادەربڕینو نوسین ڕووبەڕووی گرفتو قەیرانی گەورە بۆتەوە، بەشێوەیەك لەرابردوودا کتێبو نوسینەکانی کەسێکی وەك(عەلی عەبدورازق) بەناونیشانی(الاسلام واصول الحکم)واتە ئیسلامو بنەماکانی فەرمانڕەوایەتی قەدەغەکراوو خۆیشی تەکفیرکرا لەلایەن دامەزراوەی ئەزهەرەوە. هەروەها(نەصر حامد ئەبو زێد)یش ڕووبەڕووی هەمان

تۆمەتبارکردنو ڕێگرتن لەدەربڕینی بیروڕاکانی بۆوە.[36]
ڕۆژ بەرۆژیش ئازادی بەگشتیو ئازادی رادەربڕینو ئازادی قسەکردنو نوسین تووشی کێشەو قەیرانی کوشندە دەبێتەوە، بەجۆرێك دامەزراوەی ئەزهەر سانسۆری زۆر توندی خستۆتە سەر ئەو نوسینو بڵاوکراوەو کتێبانەی کەبەگوێرەی لێکدانەوەو راڤەی ئەو دامەزراوەیە بەمایەی سوکایەتیو گاڵتەکردنو رەخنەگرتن لەئاینی ئیسلامو کەسایەتیو تەعالیمەکانی لێکدەداتەوە. بۆیە چەندین نوسەرو رۆژنامەنووسو رۆشنبیر لەلایەن دامەزراوەی ناوبراوەوە تەکفیر کراونو نوسینو بیروراکانیان قەدەغەکراوە. بەمدواییانەش فیلمێکی سینەمایی بەناونیشانی(جەنگی بەدری گەورە)نەهێڵرا لەمیسر بەرهەم بهێنرێتو پێشەکەش بکرێت، بەبیانووی ئەوەی کەکەسایەتی(حەمزە)ی مامی پێغەمبەر(د.خ)ی تێدا بەرجەستەکراوەو ئەمەش بەگوێرەی لێکدانەوەی دامەزراوەی ئەزهەر لەرووی ئاینی ئیسلامەوە رێگە پێنەدراوە.[37] هەروەها کتێبی سێکسو خۆشەویستی لەژیانی پێغەمبەردا(الجنس والحب فی حیاە النبی)ی ژنە نوسەر(بسنت رشاد) کەخۆیشی ژنێکی داپۆشراوی موسوڵمانە قەدەغەکراوو لەچاوپێکەوتنێکی خۆیشیدا لەبەرنامەی(ایچاوات)ی کەناڵی ئەلعەرەبیەدا ئەوەی راگەیاند کەنەك کتێبەکەی قەدەغەکراوە، بەڵکو خۆیشی

لەلایــەن مامۆســتایەکی ئاینییــەوە لــەو ولآتــەدا تەکفیرکراوە.[38]

ئازادی ئازادی رادەربڕین لەولآتانی ئاسیا

لەزۆربـەی دەسـتوری ولآتـانی ئاسـیا مـاددەو برگـەی یاســایی ســەبارەت بــەئازادی‌و ئــازادی رادەربــڕین تەرخانکراوە، بەلآم هەموو ئەمانەش لەواقیعی رۆژانـەدا جێبەجێ ناکرێن. بەگوێرەی راپـۆرتی چـاودێرانی مـافی مـرۆڤ لەهەریەکـە لـەولآتانی ڤێتنـام‌و کۆریـای بـاکوور پێشێلکردنی مافی مرۆڤو ئازادییە گشـتییەکان هەیـە. هەروەها لەولآتێکی وەکو سـعودیەدا تـاوەکو ئێسـتا ژن مافی ئازادی لێخوڕینی ئۆتۆمبیلی پێنەدراوە. هاوکـات لەزۆربەی ولآتانی ئاسیا چەندین نوسـەرو رۆژنامـەنووس لەمــەڕ ئــازادی رادەربــڕین‌و بــیروڕا زینــدانیکراون‌و هەندێکیشیان دادگـایی کـراون‌و سـزای یاسـایی دراون‌و بەشێکیشیان بۆدەرەوەو بـۆ ولآتـانی ئـەوروپاو رۆژئـاوا هەڵهاتوون.

ئازادی‌و ئازادی رادەبڕین لەدەستوری هەرێمی کوردساندا

سەرەتا بەپێویستی دەزانم باس لەئازادی رادەربڕین بکـەم لەپرۆژەی یاسای رۆژنامەنووسان کەلەم ماوەی رابـردوودا لەلایەن سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانەوە پەسـەندکرا. چونکە ئازادی رۆژنامەگەری بەبنەمایەکی گرنگی ئازادی رادەربڕین‌و نوسین‌و بیروڕا دادەنرێت، هەرچـەندە زۆربـەی رۆژنامەنووسان‌و نوسەران‌و رۆشـنبیران گلـەیی‌و تێبینـی زۆریان لەسەر پرۆژە یاساکە هەبوو، بـەلاّم پـاش هەنـدێ دەستکاری لەلایەن سەرۆکایەتی هـەرێمی کوردسـتانەوە پەسەندکرا.

لــەماددەی یەکــەمی پــرۆژە یاســاکەدا هــاتووە کە:"رۆژنامەگـەری ئـازادەو هـیچ سانسـۆرێکی لەسـەر نییــەو ئــازادی رادەربــڕین‌و بلاّوکردنــەوە بۆهــەموو هاولاّتییـەك لەچوارچـێوەی رێزگرتنـی مـاف‌و ئازادییـە تایبەتییــەکانی تاکەکــەکان‌و تایبەتمەنــدێتی ژیــان‌و پابەندبوون بەئیتیکی رۆژنامەگەری بـەپێی بەیاننامـەی فیدراســیۆنی نێودەوڵــەتی رۆژنامەنوســان(ســاڵی 1954هــەموار کــراوە)دەســتەبەرە".[39] هــەروەها لەبڕگـەی یەکـەمی مـاددەی نۆیـەمی هـەمان پـرۆژە یاساکەدا هاتووە:"رۆژنامەنووس‌و سەرنوسەر بەبڕێك پارە سـزادەدرێت کەلـە(1)ملیـۆن دینـار کـەمتر نـەبێت‌و لە(10)ملیۆن دینار پتر نەبێت، لەکاتێکدا یـەکێك لـەم خالاّنەی خوارەوەی بلاّوکردەوە:

1. چـاندنی تـۆوی ڕق‌و کینـەو لێکترازانـدنی پێکهاتەکانی کۆمەڵ.
2. سـوکایەتیکردن بـەبیروباوەڕو پیرۆزییـە ئاینییەکان.
3. سـوکایەتیکردن بەسـیمبوڵ‌و پیرۆزییـە ئاینییەکانی هەر ئـایین‌و ئاینزایـەك‌و لەکـەدار کردنیان.
4. جنێودان‌و تۆمەت هەڵبەستن‌و ناوزڕاندن.[40]

بـەڵام ئـەوەی لێـرەدا هـەم بـۆ ڕۆژنامەنووسـان‌و هـەم نوسەران‌و ڕۆشنبیرانیش کێشە دروست دەکـات، ئەوەیـە کەپێناسەی ناوزڕاندن‌و تۆمەت هەڵبەستن نـەکراوە، ئایـا ئەو کەس‌و لایەنە خـۆی پیناسـەو ڕاڤـەی ئـەو نوسـین‌و وتارانـە دەکـات کـەلای ئـەو وەك ناوزڕانـدن‌و تۆمـەت هەڵبەستن وان یان نا؟ لەلایەکیترەوە ئەوەی کەپەیوەسـتە بەچـەمکی ئایینـەوە، چـونکە واهەسـتدەکەم بەشـێك لەکێشەکانی ئازادی ڕادەربڕین هـەم لەکوردسـتان‌و هـەم لەنێوان ڕۆشنبیران‌و مامۆستایانی ئاینیـدا لەسـەر ئـەوە دروست دەبێت کەکاتێك ڕۆشنبیرێك یان نوسەرێك شتێك دەنوسـێت یـان کتێبێـك بڵاودەکاتـەوە لەلایـەن مامۆسـتایانی ئاینییـەوە بەناوزڕانـدن‌و سـوکایەتیکردن بەپیرۆزییەکانی ئایین لێکدەدرێتەوەو هەرچـی نوسـەران‌و ڕۆشنبیرانیشـە بـەئازادی ڕادەربڕینـی لێکدەدەنـەوەو

لەلایەکیتریشەوە پێیانوایە ئەو شتانەی ئەوان قسەیان لەبارەوە کردووە موقەدەس و پیرۆز نین.

هەرچی پێگەی ئازادی و ئازادی رادەربڕین و نوسین و بیرورایە لەرەشنوسی دەستوری هەرێمی کوردستاندا ئەوا دەربارەی ئازادی ماددەی(19)لەرەشنوسی دەستوری هەرێمدا بەمجۆرە هاتووە:"هەموو کەسێك مافی ژیان و ئاسایش و ئازادی هەیە و ناتوانرێ لەو مافانە بێبەشبکرێ بان کۆت و پێوەند بکرێ، تەنها بەگوێرەی یاسا و لەسەر بڕیارێکی دەرچوو نەبێت لەلایەنێکی دادوەریی تایبەتمەندەوە".[41]

هەروەها لەماددەی(24)یشدا هاتووە کە:"سزا تاتاکەکسییە و ئازادی مرۆڤ و کەرامەتی پارێزراوە".[42]

لەلاکەیترەوە ئەو ماددانەش کەپەیوەندیان بەئازادی رادەبڕینەوە هەیە، بریتییە لەماددەی(59)کەبەمشێوەیە باس دەکات:"هەموو تاکەکەسێك مافی ئازادی بیرورا و رادەربڕینی هەیە". هەرچی ماددەی(65)یشە لەمبارەوە دەڵێت:"زۆر کردن لەئایندا نیە و هەموو تاکەکەسێك ئازادی بیروبۆچوون و ئاین و بیروباوەڕی هەیە و حکومەتی هەرێم کەفالەتی پاراستنی ئازادی هاولاتیانی لەئەستۆدایە لەموسوڵمان و مەسیحی و ئێزیدییەکان و جگە لەوانیش بۆئەوەی مومارەسەی پەرستش و رێو رەسم و سروتەکانیان بکەن، هەروەها رێزگرتنی

مزگەوتەکانو کەنیسەو شوێنەکانی تری پەرستشو پەرەپێدانیان لەئەستۆی حکومەتی هەرێمدایە". [43]

پەراوێزەکانی بەشی دووەم

1. د.محمد عابد الجابری: الديمقراطية وحقوق الانسان، سلسلة الثقافة القومية، قضايا الفكر العربی(29)، مرکز دراسات الوحدة العربية-مصر،ط3،بيروت،2004،ص(174).
2. ڕێبین ئەحمەد هەردی: لەنێوان مەلا عوزەیرو خاتوو ئەحلام مەنسوردا، ماڵپەڕی ڕۆژنامەی(ئاوێنە)، http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=14
3. محمد عابد الجابری: الديمقراطية وحقوق الانسان.........المصدر السابق،ص(174).
4. د.عبدالحليم موسي يعقوب: حرية التعبير الصحفی فی النظم السياسية العربية،ط(2003)، عمان-اردن، دار مجدلاوی للنشر والتوزيع، ص(40).
5. الشيخ نديم الجسر:فلسفة الحرية فی الاسلام، من بحوث مجمع البحوث الفقهية،جزء الاول، ص(160).

6. د.عبدالحليم موسي يعقوب: حرية التعبير الصحفى فى..........المصدر السابق،ص(39).
7. نفس المصدر، ص(40-45).
8. د. فوزى البدوى: المحنة وحرية التفكير الدينى فى الاسلام الكلاسيكى، مجلة(العربية)لحقوق الانسان،عدد(4)فبراير(1997)،ص(33).
9. د.رمضان محمد بوطى: الحقوق والحريات المدنية والسياسية فى الاسلام،منشور ضمن سلسلة ندوات الحوار بين المسلمين: حقوق الانسان فى الاسلام بين الخصوصية والعالمية، مؤسسة ال البيت، الرباط،1997،ص(163).
10. نفس المصدر، ص(48).
11. نفس المصدر، ص(41).
12. د.مصطفى عبدة: الدين والابداع،ط1999،3، مكتبة مدبولى- قاهرة،ص(16).
13. المنذرى: الترغيب والترهيب،ج4، تحقيق: محمد الدمشقى، مطبعة الحلبى، ص(6).
14. محمد عابد الجابرى: الديمقراطية وحقوق الانسان.........المصدر السابق،ص(175).
15. ابو علاء المودودى: نظرية الاسلام و هدية فى السياسة والقانون والدستور، دار الفكر، دمشق،بيروت،1964، ص(361).

16.د.عبدالحليم موسي يعقوب: حرية التعبير الصحفى فى...........المصدر السابق،ص(98).
17.سەلام عەبدولکەریم: بزوتنەوەی شعوبیەت لەمێژووی ئیسلامدا، هۆکاری سەرهەڵدان‌و کاریگەرییەکانی،چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیریی، لەبڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتی‌و چاپ‌و بڵاوکردنەوە، وەزارەتی رۆشنبیریی، سلێمانی،2004،لا(30-35).
18.د.عبدالحليم موسي يعقوب: حرية التعبير الصحفى فى...........المصدر السابق،ص(43).
19.نفس المصدر، ص(47).
20.نفس المصدر، ص(55-56).
21.عبدالقادر عودة: التشريع الجنائي الاسلامى مقارنا بالقانون الوضعى، مطبعة نشر الثقافة الاسكندرية، ص(36).
22.سفيان بن حميدة: حرية الراى والتعبير فى المفهوم، ص(14).
23.نفس المصدر، ص(15).
24.د.عبدالحليم موسي يعقوب: حرية التعبير الصحفى فى...........المصدر السابق،ص(67-68).
25.د.فيصل شنطاوى:حقوق الانسان وحرياته الاساسية، دار الحامد عمان-اردن،1997ن ص(219).
26.نفس المصدر.

27.سفيان بن حميدة: حرية الراى والتعبير فى المفهوم.....
المصدر السابق، ص(17).
28.محمد الغزالى: احياء علوم الدين، كتاب الامر بالمعروف والنهى عن المنكر، دار المعرفة، بيروت، ص(252).
29.نفس المصدر، ص(253).
30. Concordia-local Iraqi Kurdistan region ngo for peace> democracy and suitaible development.
31.نفس المصدر.
32. ئینتەرنێت، ماڵپەری ویکیپیدیا، فەرهەنگی ئازاد.
33.هەمان سەرضاوة.
34.سەلام عەبدولکەریم: دەربارەی ئازادی بیروڕاء رادەربڕین، رؤذنامەی کوردستانی نوێ،ذمارة(4258)شةممة(2007/5/3).
35.هەمان سەرضاوة.
36.. د. رجب بو دبوس : الاسلام ومسالة الحكم، تالة للطباعة والنشر، طرابلس، مؤسسة الانتشار العربى، بيروت – لبنان، الطبعة الاولى، 2001، ص (59-70).
37.بۆ زانینی وردەکاری قەدەغەکردنی فیلمی بەدری گەورە لەلایەن دامەزراوەی ئەزهەرەوە بڕوانە ئەم ماڵپەرە:

http://www.sudaneseonline.com/cgi-bin/sdb/2bb.cgi?seq=msg&board=170&msg=1219148013&rn=2

38.بۆ زانینی زانیاری زیاتر لەسەر قەدەغەکردنی کتێبی(سێکس و خۆشەویستی لەژیانی پێغەمبەردا)ی ژنە نوسەر(بسنت ڕەشاد)بڕوانە ئەم ماڵپەڕە:
http://www.alarabiya.net/articles/.20.08/02/14/45651.htm

39.ماڵپەڕی ڕۆژنامەی(هاوڵاتی)،دەقی یاسای ڕۆژنامەگەری پەسەندکراو لەلایەن سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانەوە:
http://www.hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=3143&LinkID=67

40.هەمان سەرچاوە.

41.بۆخوێندنەوەی دەقی تەواوی ڕەشنوسی دەستوری هەرێمی کوردستان سەیری ئەم سەرچاوەیە بکە:
**http://www.yallayaarab.biz/vb/showthread.php?t=94474**

42.هەمان سەرچاوە

43.هەمان سەرچاوە.

بەشــی ســێیەم(هۆکارەکــانی قــەیرانی ئــازادی ڕادەربــڕین لەکوردستاندا)

**" قســـەکردن لـــەبارەی**

**ئازادی ڕادەربڕینەوە، چوونە ناوەوەیە بۆناو کێڵگەی مین "**

**عەلی حەرب**

لەڕاستیدا گرنگە لەم بەشەدا تاوتوێی هەندێ بابــەتی گــرنگو هەستیار بکــەین، بــەجۆرێك دەبــێ بــەدوای ئــەو هۆکارانــەدا بگــەڕێین کەلەمــەڕ چــەمکی ئــازادیو ئــازادی ڕادەربــڕینو ســـنورەکانی بەریەککـــەوتنو پێکـــدادانی نێـــوان هێـــزە کۆمەڵایەتییـــە جیاوازەکـــانو وەك هەنـــدێکیش دەڵـــێن دووکەرتبوونو دوورکەوتنەوە لەنێوان ڕۆشنبیرانو مامۆستایانی ئاینیدا دروستکردووە.

بەبڕوای ئێمە چەند هۆکارو پاڵنەرێك لەپشتەوەی ســەرهەڵدانی ئەم قەیرانــەوە ئامادەییــان هەیــە، بەشــێوەیەك ئــەم کێشــەیە

پەیوەندی بەڕوانینو جیهانبینی جیاوازی هێزو کەسو گروپە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیەو لەلایەکیتریشەوە پەیوەندی قوڵی بەکولتوری کوردیو ئاستەکانی کرانەوەو داخرانی کولتورییەوە هەیە. هەروەك کێشەی ئازادی رادەربڕین پەیوەندیشی بەنەبوونی دیالۆگو گفتوگۆی بەردەوامی نێوان کەسو گروپو هێزە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی کوردیو باڵادەستیو هەژموونی بیری ئوسوڵیو گوتاری نەفیکردنو سڕینەوەو بێبایەخ سەیرکردنی بەرامبەرو یەکترییەوە هەیە. دواجار ئەم قەیرانە بەدەریش نییە لەکێشەی کرانەوەو داخران لەنێو گوتاری ئاینیو ئیسلامیدا بەگشتی. بۆیە گرنگە لەسەر هەموو ئاستەکان پەیگیری بۆقەیرانی ئازادی رادەربڕین لەکۆمەڵگەی کوردیدا بکەین. هەروەها گرنگە قسە لەسەر ماهییەتی زۆرێك لەو نوسینو کتێبو بلاوکراوەو تەنانەت سایتو ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییانەش بکرێ، کەلەلایەك بەناوی ئازادی رادەربڕینو ئازادی نوسینو رەخنەگرتنەوە بلاودەکرێنەوەو دەنوسرێنو دەخرێنەکار. لەلایەکیتریشەوە قسە لەسەر وەڵامدانەوەی هەندێ لەماۆستایانی ئاینیو ئەو کتێبو نوسراوانەش بکەین کەلەلایەن کەسو گروپو هێزە ئیسلامییەکانەوە بلاودەکرێنەوەو دەنوسرێن.

باسی یەکەم(لەنێوان ئازادی رادەربڕین سوکایەتیکردن بەموقەدەسدا)

ئەگەر بڕوامان وابێت لەکۆمەڵگەی کوردیدا موقەدەس نییەو شتێك نییە بەناوی پیرۆزییەوە، بەتایبەت ئاین و چوارچێوە ئاینییەکان، ئەوا خۆمان لەحەقیقەتێکی بەڵگە نەویست بێئاگا دەکەین، هەروەك ئەگەر بڕواشمان وابێ مرۆڤەکانی ئەم کۆمەڵگەیە بەرۆشنبیران و نوسەران و رۆژنامەنوسانەوە مافی رەخنەگرتن و قسەکردن و دەربڕینی بیروڕای خۆیانیان ئازادانە نییە، بەبیانووی شکاندنی سنورەکانی موقەدەس و بەزاندنی هێڵە سورەکانی ئاین و سێکس ودەسەڵات، بەجۆرێ چ شتێك دەسەڵات و کۆمەڵگەو مامۆستایانی ئاینی وتیان و راڤەیان کردو سنوریان بۆداناوە، ئیدی بڕاوەتەوەو بڤەیەو راستی رەهاو سنوری شتە حەرام و دەست لێنەدراوەکانەو خوێندنەوەی جیاوازترو رەخنەی زانستی و بابەتی هەڵناگرێ و قەدەغەیە، ئەوا بەهەمان شێوە خۆمان گێل دەکەین. بۆیە لەم نێوەندەدا گرنگە قسە لەسەر هەردوو ئاستەکە بکەین، بۆئەوەی لەم قەیرانەی کەدروستبووەو سەرەتاکانی سەریهەڵداوە تێبگەین.

ئێمە لەشوێنێکی تری ئەم توێژینەوەیەدا باسمان لەوەکرد، کەبەشێك لەو هۆکارنەی کێشەی بۆئازادی و ئازادی رادەربڕین و قسەکردن دروستکردووە، ئەوەیە کەجیاوازی روانین و پێناسەکردن هەم بۆچەمکی ئازادی و ئازادی رادەربڕین هەیە، هەم دیسان جیاوازی لێکدانەوەو راڤەکردن و دەست نیشانکردنی ئەو پانتاییانەش هەیە کەقسەیان لەسەر دەکرێ و رەخنەیان لێدەگیرێ، بەجۆرێك لای هەندێ کەس و گروپی کۆمەڵایەتی وەك پەیرەوکردنی مافی ئازادی و ئازادی رادەربڕین

لێکدەدرێتەوەو لای هەندێکیتریش بەتایبەت لای مامۆستایانی ئاینی بەمایەی سوکایەتیو ڕەخنەگرتنو گاڵتەکردن بەئاینو سیمبوڵە ئاینییەکانو موقەددەس راڤە دەکرێ.

بێگومان بەر لەهەموو شتێك پێویستە بڕوامان بەجیاوازی هەبێت، هەر لەجیاوازی بایلۆژییەوە تادەگاتە جیاوازییە فیکریو سیاسیو بیروباوەڕییەکان. بەتایبەت جیاوازی بیروباوەڕو ئاینو بۆچوون شتێکی ئاساییو سروشتییو بەشێکیشە لەسروشتی مرۆیی هەر یەکێك لەئێمە.[1]

بەشێوەیەك وەك(ڕێبین ئەحمەد هەردی)ڕوونی دەکاتەوەو لەبارەی جیاوازییەوە دەڵێ:" خوێندکارێکی زانکۆ کەزانستی تازەی خوێندووە، تەفسیری بۆ ڕووداوو پێشهاتەکان جیاوازە لەو کەسەی کەخوێندەواری حوجرەی خوێندووەو جیاوازیشە لەو کەسەی کەهیچی نەخوێندووە".[2]

بەڵام لێرەدا گرنگە قسە لەسەر ئەوە بکەین ئایا دەکرێ هەرچی لەسەر ئاینو سیمبوڵە پیرۆزەکانی نوسراوو وتراو بڵاوکرایەوە بەبێ پشکنینو لێکدانەوەی زانستیو بابەتیو بەبێ ئاشکراکردنی ئاستی زانستیبوونو بابەتیبوون لەڕوانینو خوێندنەوەو ڕەخنەگرتنیدا بەئازادیو ئازادی ڕادەربڕینی لەقەڵەم بدەین؟ چونکە بەشێکی زۆر لەو نوسینو بڵاوکراوەو گۆڤارو کتێبانەی کەتائێستا بڵاوکراونەتەوەو دەنوسرێن، یاخود هەندێ لەو نوسینانەی کە لەهەندێ لەسایتو ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکاندا دەنوسرێن، کەبەلێکدانەوەی خۆیان ڕەخنەی زانستیو بابەتین لەئاینی ئیسلامو سیمبوڵە پیرۆزەکانی، جگە

لەفرێــدانی چــەند رســتەو رقو کینــەی بــێ مەعریفــەو دووبارەکردنەوەی قسەی هەندێ لەرۆژهەڵاتناسان ئەوا کـارێکی زانستیان نەکردووە. چونکە بەشێکی زۆری ئەو نوسینانە جگـە لەجنێودان بەئاینو قسەی ناشیرینو بازاڕیی قسەوتن بەقورئانو پێغەمبەرو دەقەکان، شتێکی تری تێدا نابینرێ کەناوی لێبنرێ رەخنەی زانستیو لێکدانەوەی بابەتی.

سەرەتا دەبێ هەندێ پرساری سەرەتایی گـرنگ بکـەین بـەوەی ئایا لەکوردستاندا هیچ دامو دەزگاو دامەزراوەیەکی زاستیمان هەیە بۆتوێژینەوە لەئاینو دیاردەی ئایینناسـی؟ ئایـا تائێسـتا چەند توێژینــەوەی زانســتیو چــەند تێــزی ماســتەرو دکتــۆرا لەبواری ئاینو ئایینناسیو رەخنەی ئاینیدا لەزانکۆو دامەزراوە زاسنتییەکانی کوردستاندا بەرهەم هاتووە؟ ژمارەی ئەو کەسو توێژەرانە چــەندن کەپســپۆڕو شــارەزاو تایبەتمەنــدن لــەبواری ئایینناسیو رەخنەی ئاینیدا؟ بێگومان نەدامو دەزگای زانستو دراساتیمان هەیە لەبواری ئاینو دیاردەی ئــاینیو ئایینناســیدا بۆلێکۆڵینەوەو توێژینــەوە، وە نــە توێژینــەوەو لێکۆڵینــەوەی زانستی ئەوتۆش لەسەر ئــاینو ئایینناســیی بەرهــەم هــاتووەو ژمارەی ئەوکەســانەی کەشــارەزان نــەك پســپۆڕو تایبەتمەنــدن لەپەنجــەکانی دەســت تێپــەڕناکات لــەبواری رەخنــەی ئــاینیو ئایینناسیدا، تەنانەت هیچ یەك لەو شتانەشمان لەئاستی گروپو هێزە کۆمەڵایەتیو ئاینیو ئیسلامییەکانیشدا نییــە، بــەڵکو ئەوەی هەیە هــەوڵی تاکەکەســیو حزبیــە. بەبــەراورد لەگــەڵ

کۆمەڵگەی تورکیو ئێرانیو عەرەبیدا ئێمە لەبەشی هەرە دواوەی ئەم بابەتەداین.

بۆیە لێرەوە تێبینی ئەوە دەکەین کەسەرەتای دەست پێکردن لەپلانی قسەکردنو رەخنەگرتنو لێکدانەوەو راڤەکردنی ئاینو ئایناسی، بونیادێکی زانستی ئەوتۆمان نییە، جگەلەوەی بەشێکی زۆری ئەو قسەکردنو رەخنە گرتنانەی کەلەسەر ئاینو بەگشتیو بەتایبەت لەبواری رەخنەی ئاینیدا بەرهەم دەهێنرێ، لەروانگەی سیاسیو ئایدۆلۆژیو ململانێی سیاسی ئەو حزبو گروپانەیە کەخۆیان بەعەلمانیو چەپ دەزانن لەگەڵ ئەو حزبو کۆمەڵو هێزانەی تر کەخۆیان ناوناوە ئاینیو ئیسلامی، ئەمە سەرەرای ئەوەی هەندێ لەنوسینو رەخنەکانی بواری ئاینیو ئیسلامی بۆبەرژەوەندیو مەرامی تاکەکەسییەو هەندێ کەس بۆدەستکەوتنی پلەوپایە کاری لەسەر دەکەن. کاتێکیش قسەکردنو لێکدانەوەو رەخنە گرتن لەبواری ئاینیدا دەچێتە نێو ململانێو بەرژەوەندییە تاکەکەسیو سیاسیو ئایدۆلۆژییەکانی نێوان کەسو گروپو هێزە کۆمەڵایەتییەکانەوە کەمتر سیمای زانستی پێوە دەبێت، ئەوکات دەبێ لەوەش دڵنیابین کەلەبری ئەوەی قسەی زانستیو بابەتیو رەخنەی جدی لەسەر ئاینو لەبواری رەخنەی ئاینیدا بکرێ، بەپێچەوانەوە قسەپێوتنو جنێودانو حوکمدانی ناڕاستو ئایدۆلۆژیو تاوانبارکردنو ناشیرین کردنو سڕینەوەی ئاینو پیرۆزییەکانی دێتەئاراوە. لەلایەکیتریشەوە کاتێك هەم ئاینو دەقە ئیسلامییەکان زۆربەیان دەخرێنە خزمەتی

بەرژەوەندیو مەبەستە سیاسیو ئایدۆلۆژییەکانی گروپو هێزە ئاینیو ئیسلامییە جیاوازەکانەوەو دەکرێنە چەكو قەڵغانی ململانێ سیاسیو ئایدۆلۆژیو تاکەکەسییەکان. هەروەها کاتێکیش مامۆستایانی ئاینی بەلێکدانەوەی خۆیان قسە لەسەر پانتایی ئازادیو ئازادی ڕادەربڕین دەکەن، ئەوا ئەوانیش جگە لەتاوانبارکردنو تۆمەتبارکردنی نوسەرانو لەهەندێ باریشدا تەکفیرکردنی ڕۆشنبیرانو نوسەران شتێکی مەعریفی ئەوتۆ لەم بورادا پێشکەش ناکەن. بۆیە لەهەردوولا کەمو کورتی هەیە، بەجۆرێك لەبەرەی ڕۆشنبیران والێکدەدەنەوە کەهیچ موقەدەسێك لەکۆمەڵگەدا بوونی نییەو هەمووی دەخەنە خانەی ڕەخنە لێگرتنی توندوتیژەوە.

هەرچەندە بەشبەحاڵی خۆم لەگەڵ سنوردارکردنو قەدەغەکردنی ئازادیو ئازادی ڕادەربڕیندا نیمو بەمافێکی سەرەکیو سروشتی مرۆڤ بەگشتیو ڕۆشنبیرانو نوسەرانیشی دادەنێم تائەو سنورەی کەئازادی تاکەکەسو گروپە ئاینیو ئەتنیو کۆمەڵایەتییەکانی تر پێشێل نەکاتو سوکایەتی بەرهەم نەهێنێت، بەڵام ناتوانم بەشێکی زۆر لەو کتێبو نوسینانەی کەبەناوی لێکدانەوەی جیاوازو ڕەخنەی زانستییەوە لەئاینو دەقە ئیسلامییەکانو لەسیمبوڵە ئاینییەکان دەگیرێت، بەنوسینو قسەکردنی زانستی دابنێمو بیخەمە چوارچێوەی ئازادی ڕادەربڕینەوە، لەکاتێکدا بەشێکی زۆری ئەو نوسینو کتێبانە بریتین لەکوفر کردنێکی بێماناو جنێودانی سوكو ناشیرینو تۆمەتبارکردنی ئاینو سیمبوڵە ئاینییەکانو

ناوزڕاندنیان بێئەوەی هیچ میتۆدێکی زانستی لەبواری نوسینو بەگشتیو لەبواری رەخنەی ئاینیدا پەیڕەوکردبێت. چونکە هەموو لایەك دەزانین رەخنەی زانستی لەئاینو رەخنەی ئاینی چۆنو لەکوێوە دەست پێدەکات، کەسادەترین پێوەری زانستی تێدا بریتییە لەدوورکەوتنەوە لەتۆمەتبارکردنو ناوزڕاندنو جنێودان. لەلایەکیتریشەوە بەهەزاران مرۆڤی کۆمەڵگەی ئێمە ئاینی وەك پێداویستییەکی رۆحی وەرگرتووەو ئامادەنییە دەستبەرداری ببێت، رەنگە لەگەڵ تێکەڵاوکردنی ئاینیشدا نەبێت بۆناو کایە سیاسییەکان.

بۆیە ئازادی رادەبڕین پێویستی بەرێکخستن هەیە تائەوکاتەی کەتوندوتیژی دروست نەکات. بەهەمان شێوە ناتوانم بەشێکی زۆری ئەو قسەکردنو لێکدانەوەو حوکمدانەی کەژمارەیەکی زۆر لەمامۆستایانی ئاینی لەسەر مینبەری مزگەوتەکانەوەو لەشاشەی تەلەفزیۆنو لەرادیۆکانەوە بەرامبەر بەکتێبو نوسینو رۆشنبیرانو نوسەران دەکرێت، بەلێکدانەوەو حوکمدانو قسەکردنی راستو دروستو تەندروستی بزانم، چونکە لەبەشێکی زۆری قسەکردنی ئەوانیشدا جگە لەتاوانبار کردنو تۆمەتبارکردنو قسە پێوتنی رۆشنبیرانو لێکدانەوەی عاتیفی، ئەوا هەست بەسیمای مەعریفەی ئاینی تیایاندا ناکرێت. بۆیە ئەوەی لەم نێوەندەدا گرنگە قسەی لەسەر بکرێ بریتییە لەرێکخستنی ئازادی رادەربڕینو قسەکردن، بەجۆرێك پێویستە هەر قسەکردنێك توندوتیژی لێکەوتەوە سنووردار بکرێت، چونکە قسەکردن نابێت ببێتە هۆی بەرهەم هێنانو هاندانی

بـــەکارهێنانی توندوتیـــژی.[3] هـــەروەك(مـــەریوان وریـــا قانیع)لەمبارەوە دەڵـێ:" ئـەوەی لەکۆمەڵگایەکـدا دەوترێـت شتێك نییە بێوەیو بێگوناهو بێکاریگـەری. ئـەوەی دەوترێـت دەکرێت ببێتە هۆکاری وێرانکردنی ژیانو زەحمەتکردنی توانای پێکەوەبوونو لێك تێگەیشتنو پێکەوە ژیان، وەکچۆن دەکرێـت ببێتە هۆکاری ئاسانکردنو جوانکردنو بەئینسانیکردنی زیاتری شتەکان".[4]

هەروەك لای فەیلەسوفێکی گەورەی وەك جۆن سـتیوارت میـل کە بەیەکەم کەس دادەنرێـت بانگەشـەی بۆئـازادی رادەربـڕین کردووە، ئازادیش پێویستی بەدانانی سنورێك هەیە. بێگومـان ئەو پێوەرو سنورە بۆئازادیو ئازادی رادەربڕین لای میل بریتیە لەئەگـەری کەوتنـەوەی توندوتیـژی لـەئازادی رادەربـڕینو قســـەکردنەوە.[5] هـــەر لـــەمبارەوە(مـــەریوان وریـــا قانیع)لەکتێبی(دەربارەی فەلسـەفەو ئیسـلامو رۆشـنگەری)دا دەڵێت:" رەخنەگرتن لـەئاین بەگشـتیو لەئیسـلام بەتایبـەت یەکێکە لەئەرکە سەرەکییەکانی رۆشنبیرو هێزە عەلمانییەکانی وڵاتی ئێمە، بەڵام ئەم ئەرکە بەوە نابێـت تـۆ قسـە بەئیسـلام بڵێـــت..."[6] ئەمـــە بەنیســـبەت رۆشـــنبیرە چـــەپو عەلمانییەکانەوە. سەبارەت بەمامۆستایانی ئـاینیش مـەریوان ئەوە دەڵێ کە" ئەم بەرێزانە(مەبەستی لەو کۆمەڵە زانا ئاینیو شـێخانی تەریقـەتو مامۆسـتایانو قوتابیـانی زانکـۆو پەیمانگەکانـە کـە لەسـەرەتای مـانگی 2008/6 دا یادداشتێکیان پێشکەشـی سـەرۆکایەتی هـەرێمو ئەنجومـەنی

وەزیرانو پەرلەمانی کوردستان کردبوو کەداوایان کردبوو سنورێك دابنرێت بۆئەو نوسینو وتارو کتێبانەی کەتیایدا هێرش دەکرێتە سەر ئاینو موقەدەسات-توێژەر-) وێنەیەك دەکێشن وەك ئەوەی ئاین لەرۆخی وێرانبوونو لەناوچوونو فەنابووندا بژی، ئەمەش لەبەرچی؟ لەبەرئەوەی جارنەجارێك لێرەو لەوێ دەنگێکی رەخنەیی بەرز دەبێتەوەو شتێك لەسەر ئاین دەڵێت کە لەگەڵ زەوقی ئەو نوخبە ئاینییەی ناو کوردستاندا ناگونجێت".(7) بۆیە مەریوان درێژەی پێدەداتو دەبێژێ:" هیچ مەترسییەك لەوە گەورەتر نییە لیژنەیەك دروستبکرێتو بڕیار بدات لەولاتێکدا چی بنوسرێتو چی بلاوبکرێتەوەو چی یاساغ بکرێت(مەبەستی مەریوان داواکاری ئەوکەسانە بوو کەپێشتر ناومان بردنو یاداشتەکەیان بەرزکردبۆوەو تیایدا داوایان کردبوو لیژنەیەك دروست بکرێ بۆرێگرتن لەو کتێبو نوسینانەی کەتیایدا سوکایەتی بەئاین دەکرێو ئەو نوسەرو رۆشنبیرانەش ئەمکارە دەکەن سزای شەرعی بدرێن- توێژەر-)"، چونکە مەریوان باس لەوە دەکاتو دەڵێت کە:"ئێمە لەدونیایەکدا دەژین سانسۆرکردن تێیدا لەمەحاڵ نزیك بۆتەوە، ئەوەی ئەمڕۆ مەلایەك سانسۆری دەکاتو لێناگەڕێت چاپ بکرێتو بلاوبێتەوە، پێنج دەقیقە دواتر لەسەر تۆڕەکانی ئینتەرنێت دەکەوێتە بەرچاوی هەموو دونیا".(8)

بۆیە بەراستی قسەکردنی بەشێکی زۆر لەنوسەرانو رۆشنبیران لەسەر ئاینی ئیسلامو رەخنەگرتنو خوێندنەوەکانیانو

بڕیاردانیان لێی وەك ئاینی بیابانو عەرەبی دەشتەکیو ئـاینی شمشـــێرو کوشـــتنو تـــالآنیو تاوانبـــارکردنی پەیامبـــەری ئیسلام(د.خ)وەك کەسێکی شـەهوانیو ئارەزووبـازو پیـاوکوژ، بەبێ توێژینەوەی زانستی، هیچ نییـە جگـە لەسـوکایەتیکردن بەهەموو ئەو شتانەی کەهەم پیرۆزنو هەم لەزەینو بیرکردنەوەو بیروباوەڕی ملیۆنان مرۆڤی مسوڵماندا ئەوپەڕی پیرۆزیو بەهاو پێگەی خۆیان هەیە. هاوکات تاوانبـارکردنو تۆمـەتبارکردنی رۆشـنبیرانو نوسـەرانیش بـەکوفرو ئیلحـادو سـوکایەتیکەر بەموقەدەسو ئاینو سیمبوڵەکانی بەبێ خوێندنـەوەی نوسـینو کتێبو بڵاوکراوەکانیانو بەبێ جیاکدرنەوەی نوسینو کەسـەکان لەیـەکتری دیسـان ئەمـەش جۆرێکـە لـەکوفرکردن بـەناوی مەعریفـەی ئاینییـەوە. چـونکە لەئاینـدا هـەرگیز حـوکمی پێشوەختو تۆمەتبارکردن نییەو بەگوێرەی دەقـی فـەرمودەش ناتوانرێ بەهیچ شێوەیەك بەهیچ کەسێك بوترێ کافرو تەنانەت لەئەدەبیاتی ئیسلامیو لەبەندەکانی جاڕنامـەی مـافی مـرۆڤ لەئیسـلامدا رێزگـرتن لـەئاینو بیروبۆچـوونی ئـەو کەسـانەی کەسەرپێچـی لـەئاینی ئیسـلام دەکـەن یەکێکـە لەرەوشـتو ئاکارەکانی مرۆڤی مسوڵمان.

بۆیە شـێوازی تەندروسـت لەروانگـەی ئاینـەوە وەڵامدانـەوەی نوسـینە بەنوسـینو قسـەکردنیش بەقسـەکردن. لێـرەوە مـن دەمەوێت قسە لەسـەر ئـەوە بکـەم لەبەرامبـەر هـەموو ئـەو نوسینانەدا کەلەسەر ئـاینو سـیمبوڵەکانی نوسـراون لەلایـەن رۆشنبیرانو نوسەرانەوەو لەلایـەن مامۆسـاتایانی ئاینییشـەوە

بەسوکایەتیو گاڵتەکردن بـەئاین لێکدراونەتـەوە، لەبەرامبـەر ئەو نوسینو ڕەخنانەدا چەند وەڵامی زانستیو بابەتی بەکتێبو وتارو بڵاوکراوە دراوەتەوە؟ چـەند مامۆسـتای ئـاینی بەشـێك لەکاتـەکانی ژیـانو تەمـەنو زانسـتی خـۆی تـەرخانکرد بـۆ وەڵامدانەوەی ئەو کتێبو نوسینو بڵاوکراوانە؟ بۆیـە ئەمـەوێ ئـەوە بڵـێم یەکـەم: ژمـارەی ئـەو کتێـبو وتـارو وەڵامانـەی کەبەکتێبو بەنوسین لەسەر ئەو کتێبو بڵاوکراوانە پێشـکەش کراون لەپەنجەکانی دەستی تێپەڕ ناکات. دووەم: هێنـدەی مـن تێبینیم کردبێت هەموو ئەو کەسـانەش کـەوەڵامیان داوەتـەو بەکتێبو نوسینو وتار بریتین لەنوخبەیەکی ڕۆشنبیرو نوسەرانو ڕۆشنبیرانو ڕۆژنامەنووسانی ناو حزبو هێزە ئیسـلامییەکان، نەك مامۆستایانی ئـاینی مزگەوتـەکان. بۆنموونـە لـەمڕووەوە هەمووی چـەند سـاڵێکی کەمـە پـرۆژەی(تیشـك)دامـەزراوە لەلایەن چەند ڕۆشنبیرێکی جیاوازی ئیسلامییەکانەوەو وەڵامی هەندێ کتێبیان داوەتەوە. لەراستیدا لێـرەدا پێویسـتە ئامـاژە بۆئەوە بکەین کـەپرۆژەی(تیشـك)سـەرەڕای بـوونی تێبینـیو سەرنجو ڕەخنە لەسەر میتۆدی ئیشـکردنو شـێوازی نوسـینی بڵاوکراوەو کتێبەکانیان، بەڵام یەکێکە لەرێگە تەندروستەکانی وەڵامدانەوەی ئەو نوسینانەی کەوەك ڕەخنە ئاراستەی ئـاینو سیمبوڵە ئاینییـەکانو گوتـاری ئـاینیو مێـژوویی ئیسـلامی کراوە. هەروەك لەپێشەکی پرۆژەی(تیشك)یشدا هـاتووە کـە:" قۆناغی یەکەمی پرۆژەی تیشك بۆراستکردنەوەی ئـەو هەڵـەو نەزانینانەیە کەبەبێ بەڵگـە لەسـەر ئـاینو مێـژوو کولتـوری

کـوردی دروسـت دەکـرێن‌و بەشـێوازێکی بابـەتی‌و زانسـتیانە موناقەشەی راو بۆچوونەکان دەکەین‌و بیێ دەمارگیریی وەڵامیان دەدەینەوە".[9] بەڕاستی گرنگە هەست بەکەمو کورتی بکرێ، چونکە هێندەی ئەوەی وەڵامدانەوەی زانسـتی نوسـین بەنوسـین گرنگـەو لەپێشـترە، ئەوەنـدە وەڵامدانـەوەی نوسـین‌و کتێـب بەهەڕەشـەو وتـاری حەماسـی‌و لێکدانـەوەی عـاتیفی‌و قسـە پێوتن‌و تۆمەتبارکردنی رۆشنبیران دروست‌و لەپێش نییە. بۆیە لێـرەوە گرنگـە چوارچـێوەیەکی گشـتی بۆجێکردنـەوەی جیاوازییەکان دروست بکەین، نەك سانسۆریان بکەین‌و هـەوڵی لـەناوبردنیان بـدەین.[10] هـەروەها نوسـین بەنوسـین‌و کتێـب بەکتێب وەڵام بدرێتەوەو پەنا ببرێتـە بـەر ئـامرازە مـەدەنی‌و روناکبیرییەکان دوور لەتوندوتیژی. بەڵام ئەوەی تاوەکو ئێستا بەدی دەکرێت زمانی قسە لەسـەرکردن‌و وەڵامدانـەوەی نێـوان هێزە کۆمەڵایەتی‌و ئایدۆلۆژییە جیاوازەکانـە، کـەبریتی بـووە لەزمانێکی زبرو توندوتیژو تۆمەتبار کردن. بـەجۆرێك(رێـبین ئەحمـەد هـەردی)لەوتارێکـدا ئامـاژەی پێـدەکات‌و دەڵێـت:" تاهەنوکـەش ئـەو زمانـەی هێـزە کۆمەڵایەتییـە جیاوازەکـان بەرامبەر بەیەك بەکاریدەهێنن، زمانێکی توندوتیژو هـەڵگری سـڕینەوەو بایـەخ پێنـەدان‌و بگـرە سـوکایەتی پێکردنـە بـەو کەسانەی رای جیاواز لەفلان یان لەفیسار گروپی هەیە".[11]

بەمانایەکیتر(رێبین ئەحمەد هەردی) کێشـەی ئـازادی‌و ئـازادی رادەربڕین، وەك گرفت‌و قـەیرانی کـەرتبوون‌و دوورکەوتنـەوەی نێوان چینی رۆشنبیران‌و مەلا ئاینییەکان لەقەڵەم دەدات. ئـەو

بڕوای وایە ئەم قەیران‌و گرفتەش لـەڕووداوی درامـای(ئاریـا)وە سەریهەڵداوە، بەشێوەیەك دەڵێ:" هەر چاودێرێك بگەڕێتەوە بۆ ئەولێشاوی نوسین‌و وتو وێژانەی ئەو ماوەیە بەرهەمی هێنـان، دەتوانێ بەئاسانی ڕادەی ئەو دڵڕەقـی‌و توندوتیژییـە ڕەمزییـە ببینێت کەلەو نوسین‌و وتو وێژانەدا ئامادەبوو".(12) هەرچەندە من لەگەڵ کاك ڕێبین لـەو خاڵـەدا هـاوڕام کـەدرامای(ئاریـا) بـەکرداری گرفـت‌و قـەیرانی لـەنێوان مامۆسـتایانی ئـاینی‌و ڕۆشنبیران‌و هونەرمەنداندا دروسـتکردو مامۆسـتایانی ئـاینی ڕەخنەیەکی توندوتیـژیان لـەو ڕۆڵ‌و کاراکتەرانـە گـرت کـەبۆ کەسایەتی مامۆسـایانی ئـاینی لەدراماکـەدا تـەرخانکرابوو، هاوکات ئەوەشیان بەمایـەی ناوزڕانـدن‌و سـوکایەتی بـەخۆیان لێکدایەوەو لەقەڵەمدا، بەڵام من لەوەدا لەگەڵ کاك ڕێبین لـەم قەیرانەدا جیادەبمەوەو بیروڕای جیاوازم هەیە کەدوو کەرتبوون‌و دوورکەوتنـەوەی نێـوان ڕۆشـنبیران‌و مامۆسـتایانی ئـاینی‌و سـەرهەڵدانی قـەیرانی ئـازادی ڕادەربـڕین‌و نوسـین لـەدرامای ئاریـاوە دەسـت پێناکـات، بـەڵکو بـەکرداری لەسـەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مـەحمودی نـەمرەوە لەسـلێمانی لەسـاڵانی بیسـتەکانی سـەدەی ڕابـردوودا دەسـت پێـدەکات، بەتایبـەت لەڕووداوی تیرۆرکردنی نوسەرو ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە(جـەمال عیرفان)کەنوسین‌و بیروڕاو بۆچوونی جیاوازی هـەبوو، ئەمـەش قبوڵ نەکرا وەك بیروڕایەکی جیـاوازو وەك دەگێڕنـەوە بـەهۆی کاریگەری مامۆستایانی ئاینییـەوە لەسـەر بـیروڕای جیـاوازو نوسین تـیرۆر کـراوە. هـەروەها کوشـتنی نوسـەر(عەبـدولخالق

مەعروف) بەهۆی نوسینی کتێبی(ئادەمیزاد لەکۆمەڵی کوردەواریدا) هەموو ئەم نموونانە پێش درامای ئاریا دەکەون لەمەسەلەی قەیرانی دوورکەوتنەوەی ڕۆشنبیرانو مامۆستایانی ئاینیو لەسەرەتاکانی سەرهەڵدانی گرفتی ئازادی ڕادەربڕین لەکوردستاندا. هەروەك سەرەتای ئەم قەیرانە ڕەنگە لەپێشتریش بێت بەتایبەت بەسەرنجدان لەهەندێ لەشیعرەکانی شاعیری مەزنی کورد(مەحوی)کەخۆی عاریفو سۆفییەکی گەورە بووە، کەچی ڕەخنەی زۆر توندی لەوشکە سۆفیو هەندێ لەمەلاکانیش گرتووە. بەهەرحاڵ لەسەردەمی ئێستای کۆمەڵگەی کوردەواریشدا تێبینی ئەوە دەکرێت کەتادێت جیاوازیو دوورکەوتنەوە دەکەوێتە نێوان مامۆستایانی ئاینیو ڕۆشنبیرانو نوسەرانەوەو بەشبەحاڵی خۆم پێشبینی دەکەم لەداهاتوودا زۆر فراوانتریش ببێت، بەتایبەت لەمەڕ مەسەلەکانی ئازادیو ئازادی ڕادەربڕین.

هەروەك بەمدواییانەش ژمارەیەك لەمامۆستایانی ئاینیو خودی ڕێکخراوی یەکێتی زانایانی ئاینی ئیسلامی ڕەخنەی توندیان لەکتێبی(جەهالەتی ئیسلامو دونیای هاوچەرخ)ی نوسەر(ئارام ڕەشید)گرتو وابزانم لەلایەن وەزارەتی ڕۆشنبیریی حکومەتی هەرێمی کوردستانیشەوە ژمارەی سپاردن لەو کتێبە وەرگیرایەوە. هەروەها ڕەخنەش لەهەریەکە(جەمال ڕەشید ئەحمەدو مهاباد قەرەداغی)و چەند نوسەرێکی تریش بەردەوامە بەبیانووی ئەوەی ئەمانە لەنوسینو کتێبو

وتارەکانیانـدا دژی ئـاینی ئیسـلامو سـیمبولْ وپیرۆزییـەکانی دەنوسن.

تەنانەت ئەگەر تادوێنیَ نوسینو کتێبو وتارو کاری هونـەری نوسەرانو رۆشنبیرانو رۆژنامەنوسـانو هونەرمەنـدانی چـەپو عـەلمانی کێشەیان دروسـتکردبێتو رەخنـە بـن بۆسـەر ئـاینو پیرۆزییەکانیو بەو هۆیەوە لەلایـەن مامۆسـتایانی ئاینییـەوە کەوتبێتنە بـەر هەڕەشـەو رەخنـەی تونـدەوە، ئـەوا لـەمڕۆدا نوسـینو رەخنـەو کـاری هونـەریو کتێـبو وتـاری هەنـدێ لەنوخبـەی رۆشـنبیرانی ئیسـلامیو نـاو هێـزو گروپـە ئیسلامییەکانو رۆشنبیرانو نوسەرانی ئیسلامی دەرەوەش لـەم رەخنە لێگـرتنو هەڕەشـە لێکردنـەی مامۆسـتایانی ئـاینیو هەندێ کەسو گروپە ئیسلامییەکانی تریش دەربازیان نـەبووەو ئەوانیشی گرتۆتـەوە. بەلْگـەش لەسـەر ئـەم قسـەیە بریتییـە لەقەدەغەکردنی پەخشکردنی زنجیرە درامـای(لیـا)کەلەلایـەن راگەیاندنی مەلْبەندی یەکی سلێمانی یـەکگرتووی ئیسـلامی کوردسـتان خۆیانـەوە بەرهـەم هـاتووەو خـەرجیو مەسـرەفی کێشراوەو لەلایەن چەند ئەکتـەرو هونەرمەنـدێکی جیـاوازەوە بەرهەم هاتووە.(لەباسێکی تری ئەم بەشەدا تیشکی زیاترمـان خستۆتە سەر ئەم زنجیرە درامایەو هۆکارەکـانی قەدەغـەکردنی پەخشـکردنی لەلایـەن مامۆسـتایانی ئـاینی نـاو خـودی یـەکگرتووی ئیسـلامی کوردسـتانەوە-توێـژەر-). هاوکـات بەلْگەیەکی تـری ئـەوەی کەهەنـدێ لەرۆشـنبیرانی نێـو حزبـە ئیسلامییەکانو رۆشنبیرو نوسەرە ئیسـلامییە بێلایەنەکانـەوە

ڕزگاریـان نـەبووە لەرەخنـەو هێرشـی مامۆسـتایانی ئـاینیو هەندێ لەکەسە ئیسلامییەکانی تر، (وەرزێر حەمە سەلیم)کـە ساڵانێکی زۆر شاعیرێکی ئیسلامیو کادیرێکی ئەکتیڤیسـتی نێـو هێـزە ئیسـلامییەکان بـووەو تەمـەنێکی زۆری لـەکاری ئیسلامیو لـەکاروباری ڕاگەیانـدنو ڕۆشـنبیریی ئیسـلامییدا بەسـەر بـردووەو ئێسـتا سەرنوسـەری گۆڤـاری(سـتاندەر)ە، بەئاشکراو ڕاشکاوی لەنوسینێکدا قسە لەسـەر ئـەوە دەکـات کەئیسلامییەکان بیروڕای ئازادو ڕەخنەیان قبوڵ نییەو تەنانەت دەڵێت:" کاتێك ڕەخنە لەحزبە ئیسـلامییەکان دەگیرێـت یـان سەرکردەیەکیان ڕاسـتەوخۆ ئـەو ڕەخنەیـە بەرەخنـەگرتن لـەو مێژووە لێکدەدەنـەوە، ڕەخنـەگرتنیش لەسـەرکردەکان بـەلای ئەوەانەوە ڕەخنەگرتنە لەئەسحابەو خەلیفەکان". (13)

باسی دووەم(کولتوری کراوەو کولتوری داخراو)

جگە لەوەی ئێمە قسەمان لەسەر ئەوە کرد کەگرنکە هـەموو نوسـینو قسـەکردنو ئـازادی ڕادەربڕینێـك توندوتیـژی ئیـدی توندوتیژی فیزیکی بێت یان توندوتیـژی ڕەمـزیو مەعنـەویو نەبینراو قەدەغە بکرێـت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا قەیرانی ئازادی ڕادەربڕین جگە لەوەی پەیوەندی بەپێناسەو خستنەڕووی دیـدو تێڕوانینە جیاوازەکانەوە هەبوو، هاوکـات پەیوەنـدی نزیکشـی بەکولتورەوە هەیە، چونکە کولتور ڕەنگرێـژی دیـدو تێـڕوانینو هەڵسوکەوتو پراکتیەکە کۆمەڵایەتییەکان دەکـات بەگشـتیو بەتایبەتیش پێناسەی ئازادیو ئازادی ڕادەربڕین. بەمانایەکیتر

ئێمــە نــاتوانین بــڕوا بــەوە بکــەین کــەئازادی ڕادەربــڕین لەپانتاییەکـدا بەئاسـانی گەشـە بکـات‌و جێبـەجێ بکـرێ‌و ئامادەیی هەبێت ئەگەر هاتوو کولتوری ئەو ژینگـەو پانتاییـە کولتورێکی داخراو بێت. واتــە ئــەوەی یارمــەتی گەشـەکردن‌و قبوڵکردنی ڕای ئازادو قسەکردنی ئـازادو ئـازادی قسـەکردن‌و ڕادەربڕین دەکات بریتییە لەکولتوری کـراوەو بەپێچەوانەشـەوە ئەوەی کۆت‌و پێوەندو سنورداری ئـازادی‌و ئـازادی ڕادەربـڕین‌و ئازادی قسەکردن دەکات‌و بەبڤەو هێڵی سورو قەدەغـەی وێنـا دەکـات بریتییـە لـەکولتوری داخـراو. چـونکە یـەکێك لەتایبەتمەندێتییەکانی کولتور تەواوکارییە، واتە پەیوەندییەکی چڕو پـڕو تـەواوکاری لـەنێوان دانـەو بەشـە جۆربـەجۆرەکانی کولتوردا هەیە، واتە کولتور هێزی ئـەوەی هەیـە کـەچ جـۆرە هەڵسوکەوت‌و بیرکردنەوەو قسـەکردن‌و ڕەفتارێـك ببەخشـێتە تاکـەکانی، چـونکە کولتـورە پێمـان دەڵـێ بۆفلانـە هێـزی کۆمەڵایەتی فلانە هەڵوێست وەردەگرین، بۆیەکێکی تریش فلان هەڵوێست.(14)

دەبێ لێرەوە ئاماژە بەخاڵێکی گـرنگ بـدەین ئـەویش ئەوەیـە کەئێمەی کورد خاوەنی کولتورێکی داگیرکـراوین، لـەنێو ئـەو کولتورە داگیرکراوەشدا ئازادی قسـەکردن‌و ئـازادی ڕادەربـڕین مافێکی قەدەغەکراوو مـافێکی زەوتکراوبـووە لێمـان‌و بگـرە هێڵی سورو بڤـەبووە. بۆیـە ئەگـەر لەئێسـتادا چـەند گـران‌و ناڕەحەت بێت قسـە لەسـەر ئاسـت‌و ڕادەو شـێوازی ئـازادی‌و ئازادی ڕادەربڕین‌و ئـازادی قسـەکردن لەکوردسـتاندا بکـەین،

دەبێ بەشێك لەزەینو بیرکردنــەوەو ئاگاییمــان بۆئــەوە بچــێت کەئێمە بەهەزاران ساڵە لەنێو کولتورێکی داگیرکراودا دەژیــن، ڕەنگە نازانستی نەبێ گەر بڵــێین ســەرهەڵدانو دەســتپێکردنی چرکەساتی ئــازادی ڕاســتەقینەو ئــازادی قســەکردنو ئــازادی ڕادەربڕین لەکوردستاندا لەڕاپەڕینی بەهاری ســاڵی(1991)وە دەست پێدەکات، ئەویش تائەم ساتەوەختە لەنێو ململانێیەکی سیاسیو ئایدۆلۆژی توندا بــووە، کــەلۆژیکی هێــزو گــروپو حزبە سیاســییەکان لەســەرەوەی پێوەرەکــانی خــودی ئــازادیو ئازادی ڕادەربڕینەوە بوون.

بۆیــە نەتــەوەو کۆمەڵگەیــەکی کولتــور داگیرکــراوو ئــازادی داگیرکراو هــەروا ئاســان نییــەو ناشــتوانێ چــەمکی ئــازادیو ئازادی ڕادەربڕین لەکاتێکی کەمو لەچەند ســاڵێکدا فۆرمەڵــە بکاتو بیخاتە ناو چوارچێوەی مەعریفیو فەلسەفی خۆیــەوە. بەڵام ئەمەش لەو ڕوانینە ڕەخنەییە لامان نادات کە لــەماوەی ئەم چەند ســاڵەی دوای پرۆســەی ئــازادیو ڕاپــەڕینی بــەهاری ســاڵی(1991)ەوە هێنــدەی هێــزە سیاســیو کۆمەڵایەتییــە جیاوازەکــان، بەخــەمی ئــــازادی سیاســــیو ئایــدۆلۆژیو بەرژەوەندییەکانی خۆیانەوە بوون، ئەوەنــدە نــەیانتوانیوە قســە لەســەر تیــۆریزەکردنی خــودی ئــازادیو لەنێویشــیدا ئــازادی ڕادەربــڕینو ئــازادی قســەکردن بکــەن. بۆیــە کــەمو کــورتی لــــەبونیادی بیرکردنــــەوەی کورددیــــدا بۆئــــازادی هەیــــە. هــەروەك(بــەختیار عــەلی) لەوتارێکیــدا بەئاشــکرا ڕوونــی دەکاتــەوەو دەڵێــت:" مێــژووی ئێمــە بــەکۆ لەســەردەمی

سەرهەڵدانی بزاوتی ناسیۆنالی-مارکسی کوردییەوە تائەمڕۆ لەکۆی بەرەکانیدا مێژووی درۆکردنو خۆدزینەوەیە لەتیۆریزاندنی ئەم چەمکە(واتە چەمکی ئازادی-تویژەر-)، مێژووی بەرزکردنەوەی دروشمی ئازادییە، بێئەوەی ئەم دروشمە لەراستیدا ناوەڕۆکێکی هەبێت، یاخود لەسنوری ململانێی سیاسیانە لەسەر دەسەڵات یان لەگەڵ دەسەڵاتدا تێپەڕیبێت". [15] ڕەنگە هۆکاری داخرانی کولتوری ئێمە بەشێکی زۆری بۆئەوە بگەڕێتەوە کەلەبنەڕەتدا کولتوری ڕۆژهەلات بەگشتی کەکولتوری کوردی ئێمەش بەشێکە لەو کولتورە گەورەو فراوانە ڕێنیسانسو ڕۆشنگەریو ریفۆرمی مەعریفیو فیکریو ئاینیو شۆڕشی عەقلانی تێدا بەدی نەهاتبیّ، چونکە کاتێك کولتور دەبێتە کولتورێکی کراوە، کەلانیکەم لەقۆناغە مێژووییە جیاوازەکاندا گۆڕانکاری بەسەردا هاتبیّو یەکێك لەو پرۆژە گرنکانەی تێدا ڕوودابێت. لەشوێنێکی تردا(بەختیار عەلی) ئەم راستیەی بەرجەستەکردووەو دەبێژێ:"یەکێك لەجیاوازییە گەورەکانی مێژووی خۆرهەڵاتو خۆرئاوا ئەوەیە کەخۆرئاوا پرۆژەی ڕۆشنگەری لەسەرەوە زەمینەسازی بۆئازادی بەمەستی خولقاندنی فەزای گونجاو بۆعەقڵی ئازاد دەکاتو هیوایشی گەیشتنە بەلەدایکبوونی ئازادی، بەڵام لەخۆرهەڵاتدا ئازادبوون واتە نیشتەجێکردنی ئازادی لەناو مرۆڤدا، هەرگیز نەبۆتە ئامانجی ئازادی". [16] هەروەها ئەوەش دەڵێ کە:"مێژووی

ئێمە گەرچی مێژووی شۆڕشی بـەردەوام بـووە، بـەڵام هـەرگیز چرکەساتێکی راستەقینەی تیۆریزەکردنی تێدانیە". (17)

فاروق رەفیق لەکتێبی(ماڵێکی لێکترازاوو ویژدانێکی بیمار)دا رەخنە لەهێزە ئاینی‌و ئیسلامییەکان دەگرێـت وەك بکـەرێکی نێـو کولتـوری کـوردی‌و پێـی وایـە کەبەشـێکی گـەورەی بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان کەبۆتە هـۆی داخرانـی کولتوری، بـەجۆرێك دەڵێـت:" هێـزە ئیسـلامییەکان دونیـای مۆدێرنەو کێشەکانی کورت دەکەنەوە بۆکێشەی ئـەخلاقی وەك ئـەوەی کەئینسـانی مـۆدێرن کێشـەی ئـەوەبێت بـاش خـۆی ناگۆڕی‌و ناپێچـێتەوە". (18) بەتایبـەت لەئێسـتادا مەسـەلەی تێکـەڵاوکردنی کـوڕان‌و کچـان لەقوتابخانـەو خوێندنگـەکانی کوردسـتاندا کـەوەك بڕیارێـك لەلایـەن وەزارەتـی پـەروەردەی حکومەتی هـەرێمی کوردسـتانەوە دەرچـووەو دەبـێ بۆسـاڵی خوێنـدنی(2008-2009)جێبـەجێ بکرێـت، بەتایبـەت لەقۆناغی بنەڕەتیدا کێشەی گەورەی لێکەوتۆتەوە، بەشێوەیەك هەر لەسەرەتای دەرچـوونی بڕیارەکـەوە مامۆسـتایانی ئـاینی بەئاشـکراو راشـکاوانە دژایـەتی خۆیـان دەربڕیـوەو وەك کێشەیەکی ئەخلاقی مامەڵەی لەگەڵـدا دەکـەن‌و دواجـار وەك گرفتێکـی ئـەخلاقیش بۆسـەر ئاینـدەی کۆمەڵگـەی کـوردی لێکدەدەنەوەو دادەنێن.

هاوکات(فـاروق رەفیـق)لەشـوێنێکی تـردا دەنوسـێت:"هێـزە ئیسلامییەکان لەئیمانێك دەدوێن کەئازادی‌و داهێنان‌و عەشقی خواوەنـدی تێدانییـە". (19) لەمبارەشـەوە(مـەریوان وریـا

قانیع)دەڵێت:" کولتور پێویستی بەجۆرێك لەرۆشنبیر هەیە، کەبەناوی موقەدەسو راستی رەهاوە نەدوێت...".[20] لەم بیروڕایانەوە دەگەینە ئەو راستییەی کەکولتوری ئێمە تاڕادەیەکی زۆر کولتورێکی داخراوبووە، هەم بەهۆی هۆکارو کاریگەرییە مێژوویییەکانەوەو هەم بەهۆی ئەو خەمساردیو ئەو کاریگەرییەی هەژموونی دیدو تێڕوانینی هێزو گروپە سیاسیو کۆمەڵایەتیو ئایدۆلۆژییەکانەوە...

باسی سێیەم(ئازادی رادەربڕینو گرفتی نەفیکردنی بەرامبەرو نائامادەیی دیالۆگ)

**" تاهەنوکەش ئەو زمانەی هێزە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان بەرامبەر بەیەك بەکاریدەهێنن، زمانێکی توندوتیژو هەڵگری سڕینەوەو بایەخ پێنەدانو بگرە سوکایەتی پێکردنە "**
**رێبین ئەحمەد هەردی**

لەم باسەدا بەگرنگو پێویستی دەزانین قسە لەسەر کارایی گوتاری نەفیکردنی بەرامبەرو نائامادەیی دیالۆگو پێکەوە ژیان بکەین لەسەر دۆخی ئازادی رادەربڕینو ئازادی قسەکردن لەکوردستاندا. راستە بەشێکی زۆری گرفتو قەیرانەکان لەنەبوونو نائامادەیی کولتورێکی کراوەوە سەرچاوە دەگرێ، بەڵام شیکردنەوەی هۆکارو پاڵنەرەکانی تریش لەشوێنی

خۆیاندا گرنگن. بەتایبەت ئەگەر چاوێك بەدۆخی سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتی کوردستاندا بگێڕین، ڕەنگە هەڵە نەبین گەر بڵێین گوتاری نەفیکردنی بەرامبەرو هەوڵی سڕینەوەو بێبایەخ سەیرکردن بەشێکی بنەڕەتی گوتاری باڵادەستی نێوان هێزە کۆمەڵایەتییە سەرەکییەکان بووە. بێگومان ئەم دۆخەش کاریگەری بۆسەر فەزای ئازادی بەگشتیو ئازادی ڕادەربڕینو ئازادی قسەکردن هەبووەو ناتوانین پشتگوێی بخەین.

بێگومان لەکوێدا ئاماژە بەبوونی گوتاری نەفیکردن هەبوو، لەوێدا ئاماژە بەکوشتنی توانای قبوڵکردنی جیاوازییەکان هەیە، چونکە بەشێکی گەورە لەقەیرانی ئازادی ڕادەربڕین لەکوردستاندا پەیوەندی بەقبوڵنەکردنی جیاوازییەوە هەیە، لەکاتێکدا ئازادی بۆخۆی پێویستی بەقبوڵکردنی جیاوازی هەیە، چونکە" هەموو کۆمەڵگەیەکی زیندوو کۆمەڵگەیە فرە دەنگو فرە باوەڕو فرە خەونو فرە هەڵسەنگاندن، هونەری بەڕێوەبردنی کۆمەڵگە لەوەدایە کەچوارچێوەیەکی گشتی بۆجێکردنەوەی ئەو جیاوازییانە دروست بکەیت...".(21)

لەمڕووەوە(مەریوان وریا قانیع)باس لەمەترسی ئەو هەوڵانە دەکات کەخۆیان لەسڕینەوەو نەفیکردنو بێبایەخکردنی بەرامبەردا دەبیننەوەو دەڵێت:" ئەوەی خەریکی ئەوەبێت ڕاوبۆچوونە جیاوازەکان لەرێگەی بێدەنگ کردنو سانسۆڕو فشار هێنانەوە چارەسەر بکات، ڕەچەتەی کۆمەڵگەیەکی نەخۆشو نائارامو پڕ نهێنیو پڕ درۆو پڕ ناپاکی دەنوسێت".(22)

هەرچی(فاروق ڕەفیق)یشە کاتێ ڕەخنە لەهێزە ئیسلامییەکانی کوردستان دەگرێت لەمەڕ هەڵوێستیان بەرامبەر جیاوازی دەڵێت:" لای هێزە ئیسلامییەکان چەمکی موسوڵمانو ئیسلام وەك بکوژی جیاوازییەکان تەماشا دەکرێت."[23]
هاوکات(مەریوان وریا قانیع)جارێکی تر لەکتێبی(شوناسو ئالۆزی)دا قسە لەسەر جیاوازی دەکاتەوەو دەبێژێ:" هەر تاکێك بۆئەوەی جیاوازییەکانی خۆی بسەلمێنێو لەچوارچێوەیەکی یاسایی دیاریکراودا پیادەیان بکات، ناچارە پێشوەخت جیاوازییەکانی ئەوانیش بسەلمێنێت...".[24]هەروەها ئەوەش دەڵێت:" کولتور پێویستی بەجۆرێك لەرۆشنبیر هەیە کەجیاوازی بوویێت بەبەشێك لەجیهانبینی".[25] بەڵام لەراستیدا هەم رۆشنبیرانو نوسەران، ئەوانەی قسەو ڕەخنەلەسەر ئاینو دەقە ئیسلامییەکانو سیمبوڵە پیرۆزەکانی بەرهەم دەهێننو هەم مامۆستایانی ئاینیش کەوەڵامیان دەدەنەوەو قسە دەکەن، نەك دەرفەتێك بۆپاراستن جیاوازییەکانی بەرامبەر ناهێڵنەوە، بەڵکو یەکتر ئەوی تر ڕەفز دەکاتەوەو نەفی دەکاتو هەوڵی بێبایەخکردنو سڕینەوەی دەدات.
لەلایەکیترەوە بەشێکیتر لەقەیرانو گرفتی ئازادی ڕادەربڕین لەنێوان رۆشنبیرانو مامۆستایانی ئاینیدا بۆنەبوونو کرچو کاڵی دیالۆگو گفتوگۆ دەگەڕێتەوە، بەجۆرێك پاراستنی ئازادیو ئازادی ڕادەربڕینو گەشەپێدانی پێویستی بەبوونی دیالۆگی نێوان هێزەکانەوە هەیە، بەتایبەت ئەو فاکتەرەی

کەیارمەتی زۆری پاراستنی ئازادی ڕادەربڕین دەدات بریتییە لەبوونی دیالۆگی بەردەوامی نێوان هێزو گروپو کەسە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان، چونکە چەند جیاوازییەکان وەك حەقیقەتی سروشتی بونیان هەبێ و جەخت لەسەر سەلماندن و پاراستنیان بکرێتەوە، ئەوا بەبێ بوونی دیالۆگ و گفتوگۆ ناتوانرێ گرەنتی پاراستنیان بکرێ و لەولاشەوە گەشەیان پێبدرێ. دەربارەی ئەم خاڵە(ڕێبین ئەحمەد هەردی)باس لەگرنگی دیالۆگ لەقەیرانی ئازادی ڕادەربڕیندا دەکات و دەڵێت:"دیالۆگ ڕێگەی سەرەکی مرۆڤە بۆئەوەی بتوانن بیروبۆچوونە جیاوازەکانی خۆیان لەگەڵ یەکدا بگۆڕنەوە و هەوڵبدەن لایەنی بەرامبەر بەو بۆچوونانە قەناعەت پێبکەن، کەبەڕاستی دەزانن. ڕادەی یەکانگیریی و ئاوێزانبوونی کۆمەڵگەیەك تاڕادەیەکی زۆر بەستراوە بەڕادەی کرانەوە و نەکرانەوەی کەناڵەکانی دیالۆگەوە لەنێوان گروپو هێزە جیاوازەکانی ئەو کۆمەڵگەیەدا".[26] هەروەها ڕێبین درێژەی پێدەدات و دەبێژێ:"دیالۆگ زەمانەتی سەرەکی پێکەوەژیان و بەردەوامی کۆمەڵگایەکەو تاکە ڕێگەی فێربوون و ڕاهاتنە بەدەنگ و ڕەنگی جیاوازو ئەو فرەیی و ئارەزوو خواستانەی لەکۆمەڵگایەکدا هەن".[27]

بەڵام(مەریوان وریا قانیع) لێبوردن وەك پێداویستییەکی گرنگی پاراستنی ئازادی ڕادەربڕین لەقەڵەم دەدات، بەشێوەك مەریوان بۆچوونی وایە کەئازادی بیرکردنەوە و ئازادی قسەکردن و هەڵسوکەوت بەبێ بیرۆکەی لێبوردن کارێکی

مەحاڵەو لەمبارەوە دەڵێت:"لێبوردن بەو مانایەی ئینسان دەست نەخاتە ناو ئازادی کەسێکی دیکەوە گەر هاتوو ئەو ئازادییە لەگەڵ تێگەیشتنەکانی ئەمدا بۆ ئازادی یەکینەگرتەوە، هەوڵنەدات شێوەی ژیانو شێوەی بیرکردنەوەی کەسێکی دیکە سنوردار بکات، چونکە لەگەڵ شێوە ژیانو شێوە بیرکردنەوەی ئەودا ناگونجێت".(28) هاوکات(ڕێبین ئەحمەد هەردی) زیاتر لەسەر چەمکی دیالۆگ دەڕواتو درێژەی پێدەدات، بەجۆرێك دەڵێ:" دیالۆگ بانگهێشتی مرۆڤە بۆئەوەی دەرفەتی بیستنی دەنگی دی تاقیبکاتەوەو لەو بازنە بێتەدەرەوەو دەرچێت کەتەنها وەك ئەشکەوتێك دەنگدانەوەی سەدای خۆی تیا دەبیستێت".(29) لەڕاستیشدا نائامادەیی دیالۆگ لەنێوان هێزە ئاینیو سیاسیو کۆمەڵایەتییە جیاوازەکانی کۆمەڵگەی کوردیدا بەگشتیو بەتایبەتیش لەنێوان ڕۆشنبیرانو نوسەرانو مامۆستایانی ئاینیدا گرفتێکی گەورەی بۆئازادیو ئازادی رادەربڕین دروست کردووە، تائەو رادەیەی کەدەتوانین ناوی بنێین سەرەتای سەرهەڵدانی قەیرانی ئازادی رادەربڕینو نوسینو قسەکردنی ئازاد.

باسی چوارەم(گوتاری ئاینیو گرفتی نائامادەیی کرانەوە)

بێگومان گرفتی نەکراوەو نائامادەیی ریفۆرمی ئاینیو پرۆژەی رۆشنگەری لەنێو گوتاری ئاینیو ئیسلامیدا بەشێك لەقەیرانو کێشەی ئازادیو ئازادی رادەربڕینو قسەکردنی ئازادی لەنێوان

هێزو کەسو گروپە کۆمەڵایەتیو سیاسییە جیاوازەکاندا پێکهێناوە. لەراستیشدا ئەگەر بڕوامان وابێت کەتەنها نوسەرانو رۆشنبیران بەدەربڕینێکی ئاینیانە لەنوسینو وتارو کتێبو بڵاوکراوەکانیاندا کوفر دەکەن، بەتایبەت لەپانتاییەکانی ئازادیو ئازادی رادەربڕیندا، ئەوا هەڵەیەکی مەنهەجی دەکەین، چونکە بەشێك لەمامۆستایانی ئاینیش بەشێوازێکی ترو بەلێدوانێکی جیاوازتر هەمان کوفری رۆشنبیریی دووبارە دەکەنەوە. بەتایبەت ئەوەی کە لەگوتاری ئیسلامی ئێستادا هەستی پێدەکرێت بریتییە لەزاڵبوونو هەژموونو ئامادەیی بەردەوامی دیدێکی موحافیزکارانەو بالادەستی روانینو بیرکردنەوەی ئسوڵییانە کەتەنها خۆی دەبینێ و حەقیقەت وەك پێدراوێکی رەهای خۆی قۆرغ دەکات. لەگەڵ رێزو حورمەتێکی زۆرم بۆمامۆستایانی ئاینی، بەلام کێشەی ئەوان لەقەیرانی ئازادی رادەربڕیندا بریتییە لەوەی کەتەنها خۆیان بەسەرچاوەی حەقیقەت دەزانن. دیارە لێرەدا مەبەستمان بەشێوەیەکی گشتییە. ئەمەش بەو حوکمەی کەمامۆستایانی ئاینی لەبەرئەوەی پێشەوای ئاینینو وەزیفەیەکی ئاینی هەستیاریان هەیەو جۆرێکن لەمەرجەعییەتی ئاینیو کۆمەڵایەتی، والێکدەدەنەوە کەمافی ئەوەشیان هەیە بەناوی دواهەمین حەقیقەتەوە قسە بکەنو تەفسیرو راڤەکردنەکانی خۆیان بە لەپێشتر لەروانینەکانی دیکە بزانن. هەڵبەتە گرنگە باس لەوەش بکەین کەبەشێکی زۆر لەو نوسەرو رۆشنبیرانەی کەرەخنە لەئاینو پیرۆزییەکانی دەگرن

لەچوارچێوەی ئازادی رادەربڕینو ئازادی قسەکردندا، روانینێکی تاکڕەوانەیان هەیەو ئەوانیش خۆیان بەدواهەمین حەقیقەت راقە دەکەن، جگەلەوەی کەبەشێکی زۆری نوسینەکانیشیان جگە لەکوفرکردنو جنێودان بەخوداو پێغەمبەرو دەقە ئاینییەکانو سیمبولە پیرۆزەکانی شتێکی مەعریفی پێشکەش ناکەن.[30] بۆئەم مەبەستە بڕوانە زۆربەی بابەتەکانی ماڵپەڕی (خوداکانو بێ خوداکانو سایتی چەپی سەربەخۆو روخساری ئیسلامو هەندێ ماڵپەڕی تر کەکوفرو جنێودان بەرەخنەی زانستی لێکدەداتەوەو بەئاشکراو بێ پێچو پەنا پڕو لێواو لێون لەکوفرو جنێودانو قسە وتن بەخوداو پێغەمبەرو ئایەتو فەرمودەکانو ئەصحابەکانو ....تاد.

بێگومان لەم نێوەندەدا بەهۆی نەبوونی کرانەوە لەگوتاری ئاینیو ئیسلامی لەکۆمەڵگەی کوردیدا تەنانەت نوسینو کارە هونەرییەکان کەکەسو گروپە ئاینیو ئیسلامییەکانیش لەپرۆسەی سانسۆرکردنو رەخنە لێگرتنو قەدەغەکردنو رێگرتن لەبڵاوبوونەوەو پەخشکردنیان بەدەر نەبوون. هەر بۆنموونە بەمدواییانە ژمارەیەك لەمامۆستایانی ئاینیو هەندێ لەکادیرانی ناو یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان(کەبەبەراورد لەگەڵ کۆمەڵی ئیسلامیو بزوتنەوەی ئیسلامیدا یەکگرتووی ئیسلامی خۆی بەکراوەتر لەقەڵەم دەداتو خۆی بەرجەستە دەکات-توێژەر-) زنجیرە درامایەکیان بەناوی(لیا)وە قەدەغەکردو نەیان هێشت لەکەناڵی سلێمانی تەلەفزیۆنی یەکگرتووەوە پەخش بکرێت، هەرچەندە ئەو درامایە لەلایەن

بەشی راگەیاندنی مەڵبەندی یەکی سلێمانی یەکگرتووی ئیسلامی خۆشیانەوە مەسرەفی کێشرابوو، هەروەها زیاتر درامایەکی ئیسلامییانەبوو، بەڵام بەهۆی نەگونجانی لەگەڵ ئادابی ئیسلامیو بەهۆی بوونی هەندێ کاراکتەرو دیمەنی پێچەوانەی بنەماکانی ئاینی ئیسلامو ئادابی ئیسلامییەوە لەژێر هەڕەشەو فشاری مامۆستایانی ئاینیدا راگیراو پاشئەوەی چەند جارێك ریکلامی بۆکرابوو.

بۆیە تاوەکو نوسینی دیرۆکی ئەم توێژینەوەیە کەدەکاتە(2008/10/5)رێگەی پەخشکردنیان نەداوە. ئەم درامایە لەرۆمانێکی فارسییەوە وەرگیراوەو شاعیرو کەسایەتی ئیسلامیو رۆشنبیر(عادل شاسواری) سیناریۆی بۆدانـاوەو(میران عەبدوڵڵا کەریم)کاری دەرهێنانی بۆئەنجامداوەو بەرهەمی ناوەندی راگەیاندنی مەڵبەندی یەکی سلێمانی یەکگرتووی ئیسلامی کوردستانە.[31] هەرچەندە ئەم درامایە چەند جارێك مۆنتاژکراوەتەوە بەمەبەستی لابردنی ئەو دیمەنانەی کەبەگوێرەی وتەی مامۆستایانی ئاینی ناو یەکگرتووی ئیسلامی خۆیان ناشەرعییەو نادروستەو بۆتەلەفزیۆنێکی ئیسلامی ناشێت. بەڵام هەر نەیتوانی لەسانسۆری مامۆستایانی ئاینی رزگاری ببێت. ئەمەش هەمان سیناریۆی درامای(ئاریا)مان بیردەخاتەوە کەئەویش بەهۆی بوونو بەرجەستەکردنی کاراکتەری مەلاو مامۆسایانی ئاینی بەشێوەیەکی خراپ دراماکەدا لەلایەن مامۆستایانی ئاینییەوە لەهەڵمەتێکی توندا توانیان دراماکە بەکەناڵی

کوردسات ڕابگـرن و پـاش پێشکەشـکردنی چـەند ئەڵقەیـەکی بەتەواوەتی ڕاگیرا.

مامۆسـتا(محەمـەد نەسـروڵڵا)کەیـەکێك لـەو مامۆمسـتاو مەلایانە بووە کەرەخنەی توندی ئاراستەی درامای(لیا)گرتووە، بەشـێکی زۆری هۆکارەکـانی قەدەغـەکردنی پەخشـکردنی دراماکەی بۆبـوونی دیمـەنی نـاو دراماکـەو بـوونی گفتوگـۆو هەڵسوکەوتی هەندێ لەکارەکتەرەکانی ناو دراماکـە هـەبووە، لەبەرئـەوەی بەقسـەی مامۆسـایانی نـاوبراو لەگـەڵ ئـادابی شەرعی و لەگەڵ ئاینی ئیسلامدا ناگونجێت. تەنانەت دەڵێت:" ئێمە وەك زانایانی ئیسلام بێدەنگ نابین و داکۆکی لەبـەهاکانی ئیسلام و داب و نەریت دەکەین".(32) هەروها پێی وایـە ئـەوان وەك زانایـانی ئـاینی وەك چـۆن ڕەخنـەیان لـەدراماکانی تەلەفزیۆنەکانی تـر گرتـووە لـەوتاری ڕۆژی هەینیـداو لایەنـە خراپـەکانیان بۆخـەڵك ڕوون کردۆتـەوە، هەرئاواشـیان دەکـرد بەرامبەر ئەو درامایەی تەلەفزیۆنی یەکگرتوو ئەگـەر پـەخش بکرایە.(33)

بۆیە لێرەوە تێدەگەین کەبەگشتی پەیوەندی بەبوون و ئامـادەیی دیدو ڕوانینی موحافیزکرانەوە هەیە کەلـەنێو گوتـاری ئـاینی ئیسلامیدا خۆی بەرجەستەکردووەو تائەم ساتەوەختە لۆژیـك و هێزی دەنگـە موحافیزکارەکـانی نـاو ئیسـلامییەکان ڕەوتـی ڕووداوو مەسەلەکانیان یەکلایی کردۆتەوەو بڕیاریان لەشتەکان داوەو کـەمترین دەرفـەت بۆبەرجەسـتەبوونی دەنگـی کـراوەو گوتاری کراوە بوونی هەیە. لەڕاستیشدا سـەرەڕای بالادەسـتی

گوتاری موحافیزکارانەی ئاینی لەکۆمەڵگەی کوردیدا. تێبینی ئـــەوەش دەکـــەین کـــەگوتاری ئـــاینی‌و ئیســـلامی هەنـــدێ لەکۆمەڵگەکانی تری جیهانی ئیسلامی وەك چۆن لـەرابردوودا کاریگەری‌و کاراییـــان هـــەبووە بەســـەر ئـــەداو شـــێوازو جـــۆری گوتاری ئیسلامی کوردستانەوە ئێستاش لەمەسـەلەی ئـازادی ڕادەربڕین‌و نوسین‌و کاری هونەری‌و ئازادی قسەکردندا بەجۆرێك لەجۆرەکان کارایی‌و کاریگـەری هەیـە. بەتایبـەت کاریگـەری مۆدێلی گوتاری ئاینی‌و ئیسلامی سعودیەو کـارایی مـۆدێلی گوتاری ئـاینی‌و ئیسـلای میسـر بەتایبـەت، کەدامـەزراوەی ئـاینی‌و ئیســلامی ئەزهـــەر خەریکـــە بەتـــەواوەتی ئـــازادی ڕادەربـــڕین‌و قســـەکردن‌و کـــاری هونـــەری لەرۆشـــنبیران‌و رۆژنامەنووسان‌و نوسەران بەرتەسك دەکاتەوە.

پەراوێزەکانی بەشی سێیەم

1. ڕێبین ئەحمەد هەردی: لەنێوان مەلا عـوزەیرو خـاتوو ئەحلام مەنسوردا، ماڵپـەڕی ڕۆژنامـەی(ئاوێنـە)، http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=
2. هەمان سەرچاوە.
3. مەریوان وریـا قـانیع: قسـەکردنی ئـازاد، ماڵپـەڕی ڕۆژنامـــــــــــەی(ئاوێنـــــــــــە)،

http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=87

4. هەمان سەرچاوە.
5. هەمان سەرچاوە.
6. مەریوان وریا قانیع: دەربـارەی فەلسـەفەو ئیسـلامو ڕۆشـنگەری، چ1، چـاپخانەی ڕەنـج، سـلێمانی، 2002،لا(22).
7. مەریوان وریا قانیع: پیاوانی دیـن چ داواکارییـەکیان هەیە؟ماڵپـەڕی ڕۆژنامـەی(ئاوێنـە): http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=29
8. هەمان سەرچاوە.
9. بڕوانـە ماڵپـەڕی پـرۆژەی تیشـك بـۆبینینی کتێبـەکان: /http://www.tishkbooks.com ، هـەروەها بڕوانـە پێشـەکی کتێبـی عومـەر کـەمال دەروێـش: نـەزامیو بێشـەرمی، بەشـێك لەچەواشـەکارییەکانی مـەریوان هەڵەبجـەیی لـەکتێبی(سـێکسو شـەرعو ژن لەئیسـلامدا)، چ1ن2006نسلێمانی، چاپخانەی چوارچرا،لا(3).
10. مەریوان وریا قانیع: پیاوانی دیـن........سەرچـاوەی پێشوو.

11.ڕێبین ئەحمەد هەردی: لەنێوان مەلا عوزەیرو..........سەرچاوەی پێشوو.
12.هەمان سەرچاوە.
13.وەرزێر حەمەسەلیم: حزبە ئیسلامییەکان پیرانە بیردەکەنەوە،گۆڤاری(ستاندەر)، ژمارە(289ئەیلولی2008، لا(42).
14.مەریوان وریا قانیع: ناسیۆنالیزمو سەفەر، کورد لەدیاسپۆرا، چاپی یەکەم، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی،2005،لا(90).
15.بەختیار عەلی:دەربارەی عەقڵی ئازاد، لەوەڵامی پرسیاری خوێنەرێکدا دەربارەی وشەی(وشەی ئازاد) لەگوزارەی(ڕۆژنامەی ئازاد)دا،بڕوانە ماڵپەڕی بەختیار عەلی http://www.bachtyar-ali.com/new_writing.php?subject=1-1.
16.هەمان سەرچاوە.
17.هەمان سەرچاوە.
18.فاروق ڕەفیق : ماڵێکی لێکترازاو ویژدانێکی بیمار، چ1، چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی 2002، لا(37).
19.هەمان سەرچاوە.
20.مەریوان وریا قانیع: شوناسو ئاڵۆزی، چەند وتارێک دژ بەدۆگماتیزم، چاپی یەکەم،چاپخانەی ڕەنج، سلێمانی،2004، لا(181).

21.مەریوان وریا قانیع: پیاوانی دین........سەرچاوەی پێشوو.

22.هەمان سەرچاوە.

23.فاروق رەفیق : ماڵێکی لێکترازاو ویژدانێکی بیمار.........سەرچاوەی پێشوو، لا(43).

24.مەریوان وریا قانیع: شوناس‌و ئاڵۆزی، چەند وتارێک دژ بەدۆگماتیزم، چاپی یەکەم،چاپخانەی رەنج، سلێمانی،2004، لا(181).

25.هەمان سەرچاوە.

26.رێبین ئەحمەد هەردی: لەنێوان مەلا عوزەیرو...........سەرچاوەی پێشوو.

27.هەمان سەرچاوە.

28.مەریوان وریا قانیع: ئازادی‌و چاوساغەکانی، ماڵپەری رۆژنامەی(ئاوێنە)، http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=19.

29.رێبین ئەحمەد هەردی: لەنێوان مەلا عوزەیرو...........سەرچاوەی پێشوو.

30.سایتی خوداکان

31.یەکگرتووی ئیسلامی درامای(لیا)قەدەغە دەکات، بەدواداچوونی(هێمن شەریف)، گۆڤاری(لڤین)، ژمارە(73)ئابی(2008)، لا(31).

32.هەمان سەرچاوە. لا(31-32).

33.هەمان سەرچاوە.

ئەنجام

پاش تاوتوێکردنی بیروڕاکانی ئەم توێژینەوەیە گەیشتینە لەباری قەیرانی ئازادیو ئازادی رادەربڕین لەکوردستاندا ئەم ئەنجامانەی لای خوارەوە:

- ئازادی بەگشتیو ئازادی رادەربڕین مافێکی سەرەکیو بنەڕەتی مرۆڤە، بەجۆرێك مرۆڤ بەبێ ئازادیو بەبێ تونایو ئازادی رادەبڕینو قسەکردن بوونی نیە. بۆیە پێویستە هیچ جۆرە سانسۆرو قەدەغەکردنێك لەسەر ئازادیو جۆرەکانی نەبێت،

بەڵکو ئەوەی پێوستە هەبێت، بریتیە لەرێکخستنی ئازادیو ئازادی رادەربڕین بەجۆرێك کەدوور بێت لەزیان گەیاندنو بەرهەم هێنانی توندوتیژیو بەزاندنی سنوری ئازادییەکانی ئەوانیتر.

- بیروراو بۆچوونی جیاواز دەربارەی ئازادیو ئازادی رادەربڕین هەیە، بەجۆرێك هەرچی دیدی ئاینیو ئیسلامی هەیە لەگەڵ سنوردار کردنو کۆتو پێوەند کردنو تەنانەت سانسۆرکردنو قەدەغەکردنو حەرامکردنیشدایە، ئەگەر هاتوو پێچەوانەی بنەماکانی ئاینی ئیسلامو مەبەستەکانی شەریعەتو هەروەها بەمایەی زیان بۆکۆمەڵگە کەوتەوە. بەلاّم گرفتە لێرەدا ئەوەیە کەپێناسەیەکی وردو دیاریکراو نییە بۆزیان گەیاندن، بەشێوەیەك سیفەتێکی لاستیکی هەیەو فرە لێکدانەوەو فرە راڤەکردن زۆر هەڵدەگرێ، بەجۆرێك هەر گروپو کەسایەتییەکی کۆمەلاّیەتی دەتوانێ، هەر جۆرە رەخنەیەك بەو شێوەیەی خۆی دەیخوازێت لێکبداتەوەو بەمایەی زیانی لەقەڵەم بدات.
- ئەوەی تێبینی دەکرێت خەریکە مەسەلەی ئازادی رادەربڕین دەبێتە یەکێك لەگرفتەکانی گۆڕەپانی رۆشنبیریی کوردیی، بەجۆرێك لەماوەی رابردوودا زۆر نوسینو کتێبو وتارو کاری هونەریش کەوتوونەتە بەردەم قەدەغەکردنو سانسۆرو

ڕەتکردنـــەوەوەو خەریکیشـــە دیســـان جیـــاوازیو لێکدووربییـــەك لـــەنێوان ڕۆشـــنبیرانو مامۆســـتایانی ئاینی لەسەر ئازادی نوسینو ئازادی ڕادەربڕین دێتـە ئاراوەو دووریش نییە سنوری سانسۆرو قەدەغەکردن لەســـەر نوســـینو کتێـــبو وتـــارو بـــیروڕاو کـــارە هونەرییەکان فـراوانتر ببێـت. بـەجۆرێك ئـەم دۆخـە وابڕوات پانتایی قەیرانەکە گەورەتر دەبێت.

- لەڕاستیدا هۆکارەکـانی قـەیرانی ئـازادی ڕادەربـڕین یەکلایەنـە نییـە، لەلایـەك بەشـێکی زۆر لەلایـەن مامۆستایانی ئاینیو مەلاکانەوە سانسـۆر دروسـت دەکرێتو قەدەغەی بیروڕاو نوسینو ئـازادی بـیروڕاو قســـەکردن دەکرێـــت، لەلایەکیتریشـــەوە هەنـــدێ لەڕۆشـنبیرانو نوسـەران بـەهۆی نوسـینی هەنـدێ نوسـینی نازانسـتیو جنێـو ئـامێزەوە کاریگـەری خراپیان لەسەر درروستبوونی سانسۆری ئاینی لەسەر پانتای ئازادی ڕادەربڕینو قسـەکردن دروسـتکردووە، بەجۆرێك هەر شتێك دەوتـرێو دەنوسـرێ بەمایـەی ڕەخنە لەئاینو پیرۆزییەکانی لێکدەدەرێتەوە.
- ئـەرکی هـەموو لایەکـە لـەبری بەرهـەمهێنانی توندوتیژیو هەڕەشەو قسەکردنی نازانستیو نوسینی نابابەتیو تۆمەتبارکردنو تەشـهیر، کـار بۆنوسـینی زانستیو قسەکردنی بابـەتی بکـاتو هاوکـار بێـت لـەجێگیرکردنی جیاوازییـەکانو پاراسـتنیو ڕێـز

لێگرتنی با لەگەڵ بیروبۆچوون‌و بیروباوەڕی خۆیشیدا نەبێت‌و نەگونجێت، بەئامانجی پەرەپێدانی دیالۆگ‌و پێکەوەژیانی ئاشتییانەی هەموو بیرو بۆچوونە جیاوازەکان‌و دوور کەوتنەوە لەزیانگەیاندن بەئازادی ئەوانیتر.

- بوونی کولتورێکی داخراو، کەهیچ پرۆسەیەکی گرنگ‌و مەعریفی وەك ڕێنیسانس‌و ڕۆشنگەری‌و ریفۆرمی ئاینی‌و شۆڕشی پیشەسازی تێدا ڕووینەداوە کاریگەری گەورەی هەبووە کە لەئێستا قەیران بۆئازادی قسەکردن‌و ئازادی ڕادەربڕین دروست بکات. بۆیە ئەوەی یارمەتی قبوڵکردنی جیاوازییەکان‌و ڕەخنەی زانستی‌و قسەکردنی بابەتی دەدات بریتییە لەبوونی کولتورێکی کراوە کەلێبوردە بێت‌و ڕەخنەو قسەکردنە ئازادەکان وەك هەڕەشەو مەترسی بۆسەر خۆی لێکنەداتەوە.
- هۆکارێکی گرنگ لەباری قەیرانی ئازادی ڕادەربڕینەوە بریتییە لەنەبوونی کرانەوەو ڕوانینی نوێ بەراستی لەنێو گوتاری ئاینی‌و ئیسلامیدا، بەجۆرێك ئەگەر بەراوردێك بکەین لەگەڵ گوتاری ئاینی‌و ئیسلامی کۆمەڵگەی فارسی‌و تورکی‌و تەنانەت عەرەبیشدا هەرچەندە سانسۆری تێدایە، بەڵام نوسین‌و کتێبی زۆر هەیە لەبارەی ڕەخنەی ئاینی‌و خوێندنەوەی بابەتی بۆئاین‌و دەقە

ئاینییەکانو مێژووی ئیسلامیو زۆر شتی تریش، زۆربەشیان قەدەغە نەکراونو سانسۆریان نەخراوەتەسەر، بەڵام ئەگەر بڕوانینە گوتاری ئاینیو ئیسلامی لەکۆمەڵگەی کوردیدا تێبینی ئەوە دەکەین هێشتا هیچ نەنوسراوەو نەوتراوە لەرووی زانستیو بابەتییەوە، کەچی هەوڵ بۆسانسۆرکردنو بەرتەسک کردنەوەی پانتاییەکانی ئازادی رادەربڕین دەکرێت.

- دواجار قەدەغەکردنی هەندێ کتێبو نوسینو وتارو کاری هونەری بەمدواییانە لەکوردستان لەلایەن مامۆستایانی ئاینییەوە ئاماژەیەکی روونە بۆئەگەری فراوانبوونو گەورەبوونی قەبارەو رووبەری کێشەی ئازادی رادەربڕین، کە ئەگەر بارودۆخەکە بەمجۆرە بگوزەرێت لەئایندەدا دەبێتە قەیرانێکی گەورە لەبواری نوسینو لەکایەی رۆشنبیریو روناکبیریی کوردیدا.

سەرچاوەکانی ئەم توێژینەوەیە

ئەلف: سەرچاوە عەرەبیەکان:

1. عبدالوهاب الكيالى: الموسوعة السياسية، المؤسسة العربية للدراسات والنشر، بيروت،1979).
2. ا.د.الخياط: الحرية السياسية فى الاسلام بين الخصوصية والعالمية، بحث منشور ضمن بحوث حقوق الانسان فى الاسلام.

3. د.محمد عابد الجابری: الديمقراطية وحقوق الانسان، سلسلة الثقافة القومية، قضايا الفكر العربی(29)، مركز دراسات الوحدة العربية-مصر، ط3، بيروت،2004.
4. د. فوزی البدوی: المحنة وحرية التفكير الدينی فی الاسلام الكلاسيكی، مجلة(العربية)لحقوق الانسان،عدد(4)فبراير(1997).
5. سفيان بن حميدة: حرية الرای والتعبير فی المفهوم، بلا طبعة وبلا مطبعة.
6. د.عبدالحليم موسي يعقوب: حرية التعبير الصحفی فی النظم العربية،ط(2003)، عمان-اردن، دار مجدلاوی للنشر والتوزيع.
7. الشيخ نديم الجسر:فلسفة الحرية فی الاسلام، من بحوث مجمع البحوث الفقهية،جزء الاول.
8. د.رمضان محمد بوطی: الحقوق والحريات المدنية والسياسية فی الاسلام،منشور ضمن سلسلة ندوات الحوار بين المسلمين: حقوق الانسان فی الاسلام بين الخصوصية والعالمية، مؤسسة ال البيت، الرباط،1997.
9. د.مصطفى عبدة: الدين والابداع، ط1999،3، مكتبة مدبولی- قاهرة.
10. المنذری: الترغيب والترهيب،ج4تحقيق:محمد الدمشقی، مطبعة الحلبی.
11. ابو علاء المودودی: نظرية الاسلام وهدية فی السياسة والقانون والدستور، دار الفكر، دمشق،بيروت،1964.

12.عبدالقادر عودة: التشريع الجنائي الاسلامى مقارنا بالقانون الوضعى، مطبعة نشر الثقافة الاسكندرية.
13.د.فيصل شنطاوى:حقوق الانسان وحرياتة الاساسية، دار الحامد عمان-اردن،1997.
14.محمد الغزالى: احياء علوم الدين، كتاب الامر بالمعروف والنهى عن المنكرن دار المعرفة، بيروت.
15.د. رجب بو دبوس : الاسلام ومسالة الحكم، تالة للطباعة والنشر، طرابلس، مؤسسة الانتشارالعربى ، بيروت — لبنان، الطبعة الاولى، 2001.
16. Concordia-local Iraqi Kurdistan region ngo for peace democracy and suitaible development
17.د.نظام عساف: مدخل الى حقوقو الانسانن عمان،1999.
18.على حرب: حقول الالغام، الاسئلة المقموعة والاجوبة المرجاءة، لةكتێبى(مابعد ذهنية التحريم)جلال صادق العظم.
19.د.عبدالرحمن الحبيب: حرية التعبير وحق التخوين والتكفير، www.al-jazeerah.comsa/2008jaz/apr/7/ar3.htm
20. وتارى محمد مير احمد: العقل والرصاص، الادمغة بين محكمة الظلام وازمنة الهلام، لەكتێبى(مابعد ذهنية التحريم)جلال صادق العظم.

بێ: سەرچاوە کوردیەکان:

1. مەریوان وریا قانیع: شوناسو ئالۆزی، چەند وتارێك دژ بەدۆگماتیزم، چاپی یەکەم،چاپخانەی رەنج، سلێمانی،2004.

2. بەختیار عەلی:دەربارەی عەقڵی ئازاد، لەوەڵامی پرسیاری خوێنەرێکدا دەربارەی وشەی(وشەی ئازاد) لەگوزارەی(رۆژنامەی ئازاد)دا،بڕوانە ماڵپەڕی بەختیار عەلی http://www.bachtyar-ali.com/new_writing.php?subject=1-1

3. فاروق رەفیق : ماڵێکی لێکترازاو ویژدانێکی بیمار، چ1، چاپخانەی رەنج، سلێمانی 2002.

4. رێبین ئەحمەد هەردی: لەنێوان مەلا عوزەیرو خاتوو ئەحلام مەنسوردا، ماڵپەڕی رۆژنامەی(ئاوێنە)، http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=14

5. سەلام عەبدولکەریم: بزوتنەوەی شعوبیەت لەمێژووی ئیسلامدا، هۆکاری سەرهەڵدانو کاریگەرییەکانی،چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی رۆشنبیریی، لەبڵاوکراوەکانی بەڕێوەبەرایەتی گشتیو چاپو بڵاوکردنەوە، وەزارەتی رۆشنبیریی، سلێمانی،2004.

6. یەکگرتووی ئیسلامی درامای(لیا)قەدەغە دەکات، بەدواداچوونی(هێمن شەریف)، گۆڤاری(لڤین)، ژمارە(73)ئابی(2008).

7. مەریوان وریا قانیع: ناسیۆنالیزم و سەفەر، کورد لەدیاسپۆرا، چاپی یەکەم، چاپخانەی رەنج، سلێمانی،2005.
8. وەرزێر حەمەسەلیم: حزبە ئیسلامییەکان پیرانە بیردەکەنەوە،گۆڤاری(ستاندەر)، ژمارە(289ئەیلولی2008).
9. بۆ بینیی کتێبەکان بڕوانە ماڵپەڕی پڕۆژەی تیشك، http://www.tishkbooks.com هەروەها بڕوانە پێشەکی کتێبی عومەر کەمال دەروێش: نەزامی و بێشەرمی، بەشێك لەچەواشەکارییەکانی مەریوان هەڵەبجەیی لەکتێبی(سێکس و شەرع و ژن لەئیسلامدا)، چ1ن2006سلێمانی، چاپخانەی چوارچرا.
10. ماڵپەڕی رۆژنامەی(هاوڵاتی)،دەقی یاسای رۆژنامەگەری پەسەندکراو لەلایەن سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانەوە: http://www.hawlati.info/NewsDetailN.aspx?id=3143&LinkID=67
11. مەریوان وریا قانیع: دەربارەی فەلسەفە و ئیسلام و رۆشنگەری، چ1، چاپخانەی رەنج، سلێمانی، 2002.
12. بۆ زانینی وردەکاری قەدەغەکردنی فیلمی بەدری گەورە لەلایەن دامەزراوەی ئەزهەرەوە بڕوانە ئەم ماڵپەڕە: http://www.sudaneseonline.com/cgi -

bin/sdb/2bb.cgi?seq=msg&board=170&msg=1219148013&rn=2

13. بـۆ زانینـی زانیـاری زیـاتر لەسـەر قەدەغـەکردنی کتێبی(سێکس و خۆشەویستی لەژیانی پێغەمبەردا)ی ژنە نوسـەر(بسـنت رەشـاد)بڕوانـە ئـەم ماڵپـەڕە: http://www.alarabiya.net/articles/20.08/02/14/45651.htm

14. ئینتەرنێت، ماڵپەڕی ویکپیدیا، فەرهەنکی ئازاد.

15. مەریوان وریا قانیع: ئازادی و چاوساغەکانی، ماڵپـەڕی رۆژنامـەی(ئاوێنـە)، http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=19

16. سەلام عەبدولکەریم: دەربارەی ئازادی بیرورا و رادەربڕین، رۆژنامـەی کوردسـتانی نوێ،ژمارە(4258)شەممە(2007/5/3).

17. مـەریوان وریـا قـانیع: قسـەکردنی ئازاد،ماڵپـەڕی رۆژنامـەی(ئاوێنـە)، http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=87

18. مەریوان وریـا قـانیع: پیـاوانی دیـن چ داواکارییـەکیان هەیە؟ماڵپـەڕی رۆژنامـەی(ئاوێنـە): http://www.awene.com/DirejeyGoshe.aspx?Jimare=29

19. بۆ بینین‌و خوێندنەوەی هەندێك لەو نوسینانەی کەڕن لەکوفرو جنێودان‌و تۆمەتبارکردن بەناوی ڕەخنەی زانستیەوە لەئاین‌و خوداو ئیسلام‌و پێغەمبەرو زۆر شتی تر بڕوانە ئەم ماڵپەڕانە: http://www.xwdakan.com، http://www.diwaroj.com/Test.php.

20. بۆخوێندنەوەی دەقی ڕەشنوسی دەستوری هەرێمی کوردستان، بڕوانە ئەم ماڵپەڕە: http://www.yallayaarab.biz/vb/showthread.php?t=94474

## بەرهەمە بڵاوکراوەکانی نوسەر

1. بزوتنەوەی شعوبیەت(گەلانی ناعەرەب)لەمێژووی ئیسلامدا، هۆکاری سەرهەڵدان‌و کاریگەرییەکانی، لێکۆڵینەوەی مێژوویی، چاپی یەکەم، بەڕێوەبەرایەتی گشتی چاپ‌و بڵاوکردنەوە، وەزارەتی رۆشنبیریی، سلێمانی، 2004ز.

2. عوسمانییەکان، لەعوسمانی کوڕی ئەرتغرولەوە تاسولتان عەبدولمەجیدی دووەم، پەیماننامەو جەنگەکان، وەرگێڕان، چاپی یەکەمو دووەم، بلاوکراوەکانی خانەی چاپو پەخشی رێنما، سلێمانی، 2008ز.
3. مێژووی پێکهاتنو پەرەسەندنی بیری تۆرانیزم، لێکۆڵینەوەی مێژوویی، چاپی یەکەم، بلاوکراوەکانی پرۆژەی کتێبی(کۆچ)، بەشی رووناکبیریی سەنتەری رووناکبیریی ئێلبەگی جاف، سلێمانی، 2007ز.
4. موقەددەسو کولتور، ئیشکالیەتی بەریەککەوتنی نێوان ئیسلامو رۆژئاوا، لێکۆڵینەوەی فیکری، چاپی یەکەم، بلاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی سەردەم، سلێمانی، 2007ز.
5. دەربارەی فەلسەفەی مێژوو... زانستی مێژوو، کۆمەڵە وتار، ئامادەکردنو وەرگێران. چاپی یەکەم، لسەبلاوکراوەکانی دەزگای چاپو پەخشی رێنما، سلێمانی، 2009.
6. ئازادی رادەربرین لەنێوان ئاینو ئازادیدا، گرفتی بەریەککەوتنی نێوان رۆشنبیرانو مامۆستایانی ئاینی لەکۆمەڵی کوردیدا، چاپی یەکەم، خانەی چاپو پەخشی سایە، سلێمانی،2009.

## ئەو بەرهەمانەی ئامادەن بۆچاپ

1. گوتاری ئیسلامی کوردیو گرفتی ئۆپۆزیسیۆنی سیاسی، لێکۆڵینەوەی فیکریو سیاسی.
2. گوتاری دەسەڵاتخوازی ئیسلامیو گرفتی بەرهەمهێنانی توندوتیژی ئاینی، لێکۆڵینەوەی فیکری.
3. لەبارەی رۆژهەڵاتناسییو کوردناسییەوە، ئامادەکردن.
4. سیستمی پەروەردەیی لەدەوڵەتانی ئەسکەندەنافیا(سوید، نەرویژ، دانیمارك)، وەرگێڕان.
5. سیستمی دیموکراسیی ئەمریکی، وەرگێران بەهاوبەشی لەگەڵ(حەسەن حسێن).
6. هەوڵە روناکبیرییەکانم لەبارەی رۆژهەڵاتناسییەوە، ئامادەکردنو وەرگێران.